# شێخ مەحمودی حەفید

(1922 – 1925)

نووسینی :

ئومێد حەمەئەمین

1429 کۆچی                    2008 زایینی

**ناوی کتێب:** شێخ مەحمودی حەفید (1922 – 1925)

**نووسینی:** ئومێد حەمەئەمین

**ژمارەی سپاردن:** (1146) ساڵی (2007)

**شوێنی چاپ:** چاپخانەی چوارچرا

**نۆرەی چاپ:** یەکەم

**ساڵی چاپ:** 2008

**نەخشەسازی:** ئیدریس سیوەیلی

**لە بڵاوکراوەکانی:** پرۆژەی (تیشک)، زنجیرە (32)

**ناونیشانی پرۆژە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت :** www.tishkbooks.com

**ئیمەیلی پرۆژە:** info@tishkbooks.com tishkbooks@yahoo.com

بسم الله الرحمن الرحيم

(لَقَد كاَنَ في قَصصهم عبرةٌ لأُولي الآلْبابِ ما كاَنَ حديثاً يفْترى)
(يوسف : 111 )

## سەرنجێکی پێویست

ئەم بەرهەمە، لە بنەڕەتدا لێکۆڵینەوەی دەرچوونەو وەك بەشێك لە پێداویستییەکانی بەدەستهێنانی پلەی بەکالۆریۆس لە مێژوودا، بە سەرپەرشتی د. ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکر، ساڵی (1998) پێشکەشی بەشی مێژووی کۆلێجی ئەدەبیاتی زانکۆی سەلاحەددین کراوە.

پێشکەشە بە:

- هەموو خاوەن هەڵوێستێک، دڵسۆز بە ئایین و نەتەوەکەی.
- دایک وباوکم کە کەمتەرخەم نەبوون لە پێگەیاندنم.
- ئەو مێژوونووسانەی کە لە شەوەزەنگی تاریکیدا بە دوای رووناکیدا دەگەڕێن.
- ئەو خەمخۆرانەی بەدوای دەروازەیەکدا دەگەڕێن بۆ خزمەتکردن بەنەتەوەکەیان.
- ئەوانەی گوێ لەوتە دەگرن و شوێن باشترینیان دەکەون.

## بەناوی خوای گەورەو دلۆڤان

### پێشەکیی

سەبارەت بە شۆڕشەکەی شێخ مەحمود و یەکەم حکومەتی کوردستان، تا ئێستا زۆر نووسین و لێکۆڵینەوەی جیاواز بڵاوکراونەتەوە، هەر لە یاداشتنامەی کەسایەتیەکانی ئەو سەردەمانە، تا لێکۆڵینەوەی زانستی و نامەی ئەکادیمی کە تیایدا بە تێروتەسەلی و گشتگیرانە لێیان کۆڵیوەتەوە، هەشیانە تەنها بوارێك یان زەمەنێکی دیاریکراوی هەڵبژاردووە، دیارە ئەم بابەخدانەش نیشانەی مەزنی و هەستیاریی ئەو قۆناغە مێژووییەیە کە گەلی کوردستان بە سەرکردایەتی شێخ مەحمود ڕۆڵیان تێدا بینی و لاپەڕەیەکی گەشیان لەو ماوەیەدا تۆمارکرد.

هەر ئەم خاڵەش هاندەری سەرەکی ئێمە بوو، بۆ لەچاپدانی ئەم توێژینەوەیە، کە زەمەنێکی دیاریکراو دەگرێتەوە و نووسەر زیاتر تیشکی خستۆتە سەر ڕووداوەکانی ساڵی (1922 – 1925) لە سەردەمی شێخ مەحموددا، نووسەری جوانەمەرگ پێنج ساڵ زیاترە ماڵئاوایی لێکردووین، نەدەبوو لەوەزیاتر لێکۆڵینەوەکەی بێناز بمێنێت، خۆ ئەگەر لە ژیاندا بوایە بێگومان ئێمەش و خۆیشی قسەمان لەسەر لێکۆڵینەوەکە دەبوو، دەتوانرا تێروتەسەل بکرابایەو کەلێنەکانی پڕبکرێتەوە.

بەو تێبینیانەشەوە هێشتا ئەم توێژینەوەیە سەنگینی خۆی هەیەو بایەخدارە، بەشێکە لە ئامانجەکانی (پرۆژەی تیشك) کە دەرخستنی ڕاستی مێژوویی‌و بڵاوکردنەوەی بابەتی زانستی‌و ئامانجدارن، دەخوازین بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبە جگە لە سوودبەخشین بە خوێنەری بەڕێز، بێتە لاپەڕەیەکی سپی لەناو دەفتەری کردارە جوانەکانی مامۆستا ئومێددا، کە تا شەهیدبوونی چاکەو چاکەخوازی مەزنترین ئاواتی بوو.

لە کۆتاییشدا دەبێت سوپاسی بنەماڵەی کاکە ئومێد بکەین بۆ هاوکاریی بێبەرامبەرمان لە دەستخستنی ئەم بەرهەمەدا.

**پرۆژەی تیشك**

### ناوەڕۆك

## ليستی هێما كورتكراوەكان

1ـ كورتكراوە كوردیەكان

ل: لاپـەڕە

و: وەرگێڕان

چ: چاپ

ژ: ژمارە

ب: بەش

بگ: بەرگ

س: ساڵ

(ب.ش): بەبێ شوێنی چاپ

(ب.س): بەبێ ساڵی چاپ

گ: گۆڤار

2ـ كورتكراوە عەرەبیەكان:

ج: الجزء

ع: العدد

س: السنة

ت: الترجمة

ط: الطبعة

ص: الصفحة

(لا.س): بدون سنة الطبع

(لا.م): بدون مكان المطبع

## پێشەکیی

لەساڵی 1914 جەنگی یەکەمی جیهانی دەستپێکرد, ژمارەیەکی بێشومار خەڵکی بێ گوناە بوونە سوتەمەنی ئەو جەنگە, لە کاتی جەنگو لە پاش تەواوبوونی, بیروباوەڕی رزگاریخوازی بڵاوبوویەوە بەناو هەموو نەتەوە جیاوازەکانی ناو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی, شۆڕشی رزگاریو سەربەخۆی لە حیجازو سوریاو میسر دەستی پێکرد, لەوێشەوە گویزرایەوە بۆ وڵاتانی دی, لەسەر هەمان باوەڕ کلێپەی سەند, بەئامانجی رزگاربوون لە داگیرکەرانی تورکو پاشانیش دژی دەوڵە تە رۆژئاواییەکان.

بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردیش لەو سەردەمانەدا بە سەرکردایەتی شێخ مەحمود بیریان لە سەربەخۆی کردەوە, ئەمەش لە مێژووی سیاسی کورددا شوێنێکی تایبەتی هەیە, چونکە ئەو سەردەمە سەردەمێکی گرنگ بووە لە دیاری کردنی چارەنوسی گەلی کورددا.

ماوەی نێوان ساڵانی 1922–1925 کە لێکۆڵینەوەکە گرتوویەتییە خۆی, پێویستە بەسەرچاوەو بناغەی توێژینەوەو تێڕوانین لە هەموو شۆڕشو بزووتنەوەیەکی کوردیو تەخمینکردنو دیاریکردنی چارەنووسی کورد لەکوردستانی عێراقدا دابنرێت.

ئەو ماوەیە ئامانجو ئاواتێکی تیادا بەرهەمهێنرا, بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردی تائێستا کە سەدەی بیستەمە ناتوانێت بە ئاشکرا بانگەوازی بۆ بکات. ئەویش دامەزراندنی حکومەتو ئەنجومەنی وەزیرانە, لەوەش زیاتر بانگەوازی مەلیکایەتیو کۆبونەوەی کوردەکانە لەدەوری شێخ مەحمود.

ئەو حکومەتو ئەنجومەنەی کە شێخ پێکیهێنا, بێ زیادەڕۆیی، ئەگەر لە حکومەتی عێراقی ئەوکاتە پێشکەوتووتر نەبووبێت کەمتر نەبووە, چونکە شێخ لەناو گەلەکەیدا بووەو ئیشۆ ئازاری گەلەکەی بەچاوی خۆی بینیوەو تەنها ساتێکیش داردەستی هیچ دەوڵەتێکی نەکردوە. وەك ئەحمەد تەقی دەڵێ: دوژمنایەتی وڵسن مندوبی سامی لەگەڵ شێخداو رازی نەبوونی بەگۆڕانی دادگاکردنی شێخ لەسێدارەوە بۆ دوورخستنەوە لەوڵات راستی ئەو وتەیەمان بۆ دەردەخاتو وەڵامێکی روونیشە بۆ ئەوانەی شێخ پیاوی ئینگلیز بووە. ئەنجومەنی وەزیرانیش بەڕادەیەك شایستەی ئەو پلەیە بوونو توانیویانە ئەوەی لەسەر شانیانە ئەنجامی بدەن.

بەڵام ئەوەندە هەیە سیاسەتی هاوپەیمانان بە گشتیو بەریتانیا بەتایبەتی لەگەڵ دروست بوونی ئەو دەوڵەتەدا نەبوو, چونکە دەمیزانی شێخ زۆر لەوە گەورەترە سنووری بۆ دابنێنو بە داردەستی خۆیانی بزانن.

لەژێررۆشنایی ئەو وتەیەی کە دەڵێن: "ئەو رووداوە دۆزە ئاڵۆزو گرفتە سیاسیانەی کاتی ئێستا، لە راستیدا بەرهەمێکی سروشتی ئەو رووداوانەیە کەلە رابووردوودا روویداوەو چۆن پێشبینیو تەخمینی داهاتوو دەکەین لەسەرئەوەی ئێستا دەی خوێنین, دەتوانین رونی بکەینەوەو شارەزابین بەو واقعە تازەی ئێستا لەسەر رۆشنایی لێکۆڵینەوەمان لە رابووردووی گەلەکەمان". هەستام بە دیاریکردنی ئەم ماوەیەی مێژووی سیاسی گەلەکەمان کە لێکۆڵینەوەکە تایبەتە پێیەوە.

بەردی بناغەی ئەم کارەی بەردەستت لێکۆڵینەوەیەکی سیاسی مێژوویە لە چوار بەش پێکهاتووە, هەر بەشەی کۆمەڵێك رووداوو ئەزمونی سیاسی گرتوەتەخۆ بە پێی گەشەکردنی هەڵوێستی سیاسی بزووتنەوەی رزگاریخوازی لەو ماوەیەدا لەبەشەکانی باسی لێوە کراوە.

لە دەروازەدا لەبەر گرنگی شێخانی بەرزنجەو سەرهەڵدانی لە واقعی کوردستانداو کاریگەرییان لە گۆڕانکاری یە سیاسیەکانی ناوچە, لە هۆیەکانی سەرهەڵدانیان دواومو کورتەیەك لە ژیانی شێخم باسکردووە.

بەشی یەکەم: پێکهاتووە لە جوڵانەوە سیاسیەکانی شێخو بارودۆخی سیاسی لە سلێمانی پاش دورخستنەوەی شێخ تیایدا ئەو هۆیانەش باسکراوە کە بوون بەهۆی گۆڕانی سیاسەتی بەریتانیاو عێراق بەرامبەر بە کوردستانو گۆڕانی هەڵوێستیان بەرانبەر بەشێخ کە بیگەڕێننەوە بۆ سلێمانی.

بەشی دووەم: گەڕانەوەی شێخ لەهیندستانو دامەزراندنی حکومەتی کوردستانی لەسلێمانی لەخۆگرتووە, کە تیایدا ئەنجومەنی وەزیران پێکهێنراو شێخ مەحمود لەپاش ئەوەی مەلیکایەتی خۆی راگەیاند, بەیانی هاوبەش لەلایەن هەردوو حکومەتی بەریتانیو عێراقیەوە سەبارەت بەو هەڵوێستەی شێخ راگەیەنرا. بەشەکە ئەو دەستەو کۆمەڵانەشی گرتووەتەوە کە پاش گەڕانەوەی شێخ لە دەوری کۆبوونەوەو کاریان لە رێڕەوی سیاسەتی کرد.

بەشی سێیەم: تایبەتە بە پەیوەندییە دەرەکیەکانی شێخ, کە دەوڵەتی تورکیا بەهۆی ئۆزدەمیرەوە لە پێشەنگیانە, هێزە کوردیەکان بەتایبەتی هەورامیەکان لە مەریوانو سمکۆی شکاك دەگرێتەوە. لەلایەکی ترەوە پەیوەندی حکومەتی کوردستان بە هەردوو دەوڵەتی بەریتانیاو عێراق پاش گەڕانەوەی شێخو هەوڵدان بۆ راکێشانی سۆزی دەوڵەتان بەلای دۆزی گەلی کورددا لەڕێگەی نوێنەری ئەو وڵاتانەوە لە تاران.

بەشی چوارەم: کۆتایی حکومەتی شێخو هۆو ئەنجامەکانی لەخۆگرتووە, هەوڵدراوە تێکچوونی پەیوەندی شێخو هەردوو دەوڵەت روونبکەینەوە لەگەڵ هۆیەکانی ئەو تێکچوونە, کە بوو بەهۆی رووخاندنی حکومەتەکەی شێخو داگیرکردنی سلێمانی لەلایەن هەردوو دەوڵەتی بەریتانیو عێراقیەوە. هاوکات لەچواچێوەی بەشی چوارەمدا بەپێی توانا لەگرنگترین ئەو فاکتەرانە دوواوین، کە بوو بەهۆی شکستی ئەو ئەزموونە سیاسیە کەم وێنەیەی گەلی کورد.

ئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوەیەش پێك هاتووە لەو دەسکەوتوو تاقیکردنەوە سیاسیانەی کەلەشۆڕشەکە وەرگیراوەو دەتوانرێت وەك پەند سوودی لێوەربگیرێت لە رێڕەوی سیاسی بزوتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کورددا.

لە راستیدا بڕوامان وایە کە لێکۆڵینەوە لەبارەی بابەتێکی وەها گرنگ لە مێژووی سیاسی گەلەکەمان, پێویستی زیاتری بەخۆ ماندوکردنو گەڕانی زیاتر هەیە, ئێمەش ئەوەمان لەبەرچاو گرتووەو بەپێی توانا هەوڵمانداوە.

لەکۆتایدا هیوادارم بەم لێکۆڵینەوەیە توانیبێتم بەشێکی کەمم لەمێژووی سیاسی گەلە ستەمدیدەکەم دەرخستبێت, بەهیوای ئەوەی ئەم جۆرە لێکۆڵینەوانە زیاتر بایەخی پێبدرێت لەلایەن فێرخوازانی بەشی مێژووەوە. سەرکەوتنو تەواوبوون نییە لەلای خوانەبێت.

**ئومێد حەمەئەمین**

1998/5/5

### یەکەم: سەرهەڵدانی بنەماڵەی شێخان

بنەماڵەی شێخ مەحمود لەبنچینەدا دەگەڕێنەوە سەر بابەعەلی هەمەدانی، کە خوشکی بابەتاهیری هەمەدانی هێناوە، کە عوریان نازناویەتی، ناوبراو بە فەیلەسوفێکی گەورە دادەنرا[1]، لە نەوە بەناوبانگەکانی ئەم بنەماڵەیە کە لە سەدەی نۆزدەدا ناوبانگیان دەرکردووە، شێخ مارفی نۆدێ و کاك ئەحمەدی شێخی کوڕیەتی، شێخ مارف بەوە ناسراوە کەزانایەکی گەورە خاوەن رەوشتێکی جوان بووە، لە کوردستان و بەتایبەتی ناوچەی سلێمانی بە چاوی رێزەوە سەیری هەموو نەوەکانی شێخ مارف کراوە[2]. بابانەکان لەخۆیان نزیك کردوونەتەوە و لە پاش گواستنەوەی پایتەختیشیان بۆ سلێمانی، لەبەر خۆشەویستی شێخ مارف مزگەوتی گەورەی سلێمانیان دروست کردووە، لەپاش شێخ مارف کاك ئەحمەدی شێخی کوڕی هاتە گۆڕەپانەوە و ناوبانگی دەرکرد، ناوبراو پایەو رێزێکی گەورەی هەبووە و وەك پیاو خوای لەناو کوردەکاندا سەیر دەکرا[3].

نەوەکانی لەبنەماڵەی بەرزنجە، پشتیان بەگەورەی و بڵندی پایەی ئەو بەستووە لەنێو کوردەکاندا، ئەوەش بەس بووە بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵاتی گشتی[4].

دەربارەی بەرزبوونەوەی ئەم بنەماڵەیە، دەتوانین دەست نیشانی چەند فاکتەرێك بکەین لەوانەش:

#### یەکەم: هۆکاری ئایینی

زۆربەی سەرکردە بەرزنجیەکان ناوبانگی ئایینیان هەبووە و سەرۆکی تەریقەتی قادری بوون[5]، بۆیە دەبینین ئاین زۆر کاریگەری هەبووە لەسەرکردایەتی کردنی ئەم بنەماڵەیە لەناوچەی سلێمانیداو، سەرکردە بەرزنجیەکان پلەی بەرزیان لەنێو کوردەکاندا وەرگرتووە، بەدرێژایی کوردستان تەکیەو خانەقایان دروست کردووە و رێبازی سۆفیگەری خۆیان تیادا بڵاوکردووەتەوە[6].

#### دووەم: رۆشنبیری و زانیاری

زۆربەی پیاوانی خێزانە بەرزنجییەکان ئارەزویان لە رۆشنبیری هەبووە و رۆشتونەتە ناو (اصول فقه)و ئەدەبو زمانەوانی، بەنموونە شێخ مارفی باپیرە گەورەیان زیاتر لە(45) دانراوو پارچە پەخشانی هەیە[7]، بابانەکان وەك زانایەکی گەورە تەماشایان کردووە[8].

#### سێیەم: رامیاری

دیارە کاری سیاسی بەشێوەیەکی گشتی چالاکی بێت یان فیکری، لەواتاکەیدا بیرێکی کۆمەڵایەتیە، تەکیەو رێبازی سۆفیگەریش شێوازی کۆمەڵایەتی پێکدەهێنێت، کە لە پاش قوتابخانە ئایینیەکان کاری کردووەتە سەر خەڵك، بە تێپەڕبوونی کات ئەم تەکیانە شێوازی سیاسیان بەخۆوە بینی، فکرەو بیری خۆیان لەناو خەڵکیدا بڵاوکردووەتەوە، بەو

---

[1] یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: شۆڕشی شێخ مەحمودی حەفید، ساغکردنەوەی کەمال نوری مەعروف، چ1، (ب.ش)، 1995، ل14.

[2] خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقیدا: لاپەڕەیەك لە شۆڕشەکانی کوردو شێخ مەحمودو سمکۆو هەستانەکە رەواندز، رێکخستن و ئامادەکردنی بۆ چاپ جەلال تەقی، بەغداد، 1970، ل16.

[3] عبدالرزاق الحسني: تأريخ الوزارات العراقية، ج1–2، ط4 للموسوعة، بيروت، 1974، ص186–187.

[4] مس بيل: فصول من التأريخ العراق الغريب، (ت: جعفر خياط)، ط2، (ب.م)، 1971، ص185–186.

[5] رەفیق حیلمی: یادداشت، کوردستانی عێراق و شۆڕشەکانی شێخ مەحمود، بگ1، بەغداد، 1988، ل33–34.

[6] طالب عبدالجبار حيدر: المسألة الكردية في الوثائق العراقية، المشكلة ـ الحل ـ النتيجة، رسالة ماجستير، كلية قانون والسياسة، جامعة بغداد، تموز 1982، ص22–23.

[7] یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 15. طالب عبدالجبار: هەمان سەرچاوە، ص23.

[8] یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 14.

شێوەیەی کە لەگەڵ بانگەوازو فیکرەکە بگونجێت, لەلایەکی ترەوە بەرژەوەندی شێخو تەریقەتەکەش[1]، بۆیە پێویست بووە وتار بدرێتو هەستیان ببزوێنرێت بۆ ئامانجی سیاسی دیاریکراو, وەك بانگەوازەکەی کاك ئەحمەدی شێخ بۆ جیهادکردن دژی رووسەکان, لەجەنگی رووسی ـ عوسمانیدا, لەساڵی (1877ـ 1878), کە بەهۆی موریدو شوێنکەوتەکانیەوە بووە, ئەو جۆرە بانگەوازانەش بانگەوازی سیاسی بوون بۆئەوەی خەڵکی تێبگەیەنرێت.

ئەم کارە یەکەم دەوری بنچینەیی بووە, کە یەکێك لە سەرکردە بەرزنجییەکان پێی هەستاوە بۆ کرنەوەی دەرگا لەسەر سەرکردە بەرزنجیەکانی تر کە بڕۆنە ناو کاری سیاسییەوە, ئەوانیش پەیڕویان کرد, بەم شێوەیە سەرکردە بەرزنجیەکان بوون بە سەرپەرشتی نەخشەکێشانی سیاسی لە ناوچەی دەسەلاتیان[2] .

کەسوڵتانی عوسمانی (سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم), شێخ سەعیدی حەفیدی کوڕی کاك ئەحمەدی شێخی دەعوەت کرد بۆ ئەستەمبوڵ, شێخ مەحمودیشی لەگەڵدابوو[3] . پاش گەڕانەوەیان لەو سەفەرە، خەڵکی بینیان تەنانەت سوڵتانیش ڕێزیان لێدەنێت، لەوەبەدوا خەڵکی زیاتر لە جاران هۆگری شێخان بوونو ڕێزی زیاتریان لێدەگرتنو بە هەموو جۆرێك کەوتنە خزمەتکردنیان[4]، شومزەیەکی تایبەتی لە نێوان شێخ سەعیدو سوڵتاندا دانرا بۆ پەیوەندیکردن[5] .

لەم کاتەدا هەندێك لەناحەزانو کاربەدەستانی دەوڵەت بارودۆخەکەیان پێناخۆش بوو, چونکە دەسەلاتیان بەهۆی زۆربوونی نفوزی شێخانەوە دەکەوتە مەترسییەوە[6] .

ئەم تاقمە لەبیانوودابوونو لە پیلانێك دەگەڕان, خۆیان لە شێخ سەعید رزگاربکەن, ساڵی 1908 کە کۆمەڵەی (إتحاد ترقي) هاتنە سەرحوکمو سوڵتانیان لابرد, کۆمەڵە لقی لە سلێمانی کردەوە, ناحەزانی بنەماڵەی شێخان وردە وردە پیلانەکەیان سەری گرتو توانیان بە هاوکاری (زەکی پاشا)ی والی موسڵ لە ئاژاوە (فتنة)کەی شاری موسڵدا کۆتایی بەژیانی شێخ سەعید بهێنن[7] .

بەلام ئەم رووداوە ئەستێرەی بنەماڵەی شێخانی نەکوژاندەوە,هەر کە دەنگوباسی ئەم رووداوە کارەساتبارە گەشتەوە شاری سلێمانی, خەڵکی شار بە پیاوو ژنەوە بەرەو موسڵ رۆیشتن, کە لەوکاتەدا شێخ مەحمود بە بریندارى خۆی شاردبووەوە, دواترلە ژێر فشاری عەشایەری کورددا کە هەرەشەی ئەوەین دەکرد گەر شێخ مەحمود ئازاد نەکرێت هێرش دەکەنە سەر موسڵ، رێگا بە شێخ مەحمود دەدرێت بگەڕێتەوە بۆ سلێمانیو لە گەڕانەوەیدا خەڵکێکی زۆر دەچن بەپیرییەوە, ماتەمێکی گەورەی بۆ دەگێڕن.

### کورتەیەك لە ژیاننامەی شێخ مەحمود

شێخ مەحمود کوڕی شێخ سەعیدی حەفید کوڕی کاك ئەحمەدی شێخ کوڕی شێخ مارفی نۆدێیە[8]، بەمەزەندە لە ساڵی (1878)دا لەدایك بووە[9]، هەر لە تەمەنی منداڵییەوە زۆر وریاو چالاكو نەترس بووە, وانەی قورئانی لەتەکیەی سلێمانی

1 طالب عبدالجبار: هەمان سەرچاوە، ص23.

2 هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

3 بۆ زیاتر شارەزابوون بگەڕێوە یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 18. خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقیدا: ل 16.

4 خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقیدا: ل 17. رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ1، ب1، ل36.

5 یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 18. رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ1، ل36.

6 خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقیدا: ل 17.

7 دەربارەی ئەم رووداوە بگەڕێوە رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ1، ب1، ل39–40.

8 بۆ زیاتر شارەزابوون بگەڕێوە یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 14. رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ1، ب1، ل33.

9 لە ساڵی 1922 تەمەنی 44 ساڵ بووە، کریس کۆچێرا: هەمان سەرچاوە، ل17.

خوێندووه, ئارەزووی زۆری لە خوێندنەوەو خۆدەرخستن کردووە, جگە لە زمانی کوردی زمانەکانی تورکیو عەرەبیو فارسی باش نووسیوەو خوێندوەتەوە, تواناى شیعرنووسینی هەبووە, لە منداڵییەوە خۆی بە سواریو یاری جەنگییەوە خەریك دەکرد, بەشداری لەو جەنگانەدا کردووە کە لە نێوان هۆزەکەیو هۆزەکانی تردا لەسەر موڵكو زەویو زار روویداوە[1].

شێخ بەپێی ئەوەی لەخێزانێکی ئایینی بووە,خۆشی مرۆڤێکی ئایینی بووەو ئایین کاریگەرییەکی گەورەی لەسەری هەبووە, بەڵام زیاتر بە کاری سیاسییەوە خەریك بووە, ئەوەش وەك میراتیەك لەباب‌و باپیرانیەوە بۆی بەجێمابوو[2]، شێخ مەحمود وەك مرۆڤێکی کورد تەواوی ئاکارو رەوشتی سەرۆکێکی کورد لەودا بەدی دەکرا[3].

شێخ مەحمود مرۆڤێکی لێهاتوو بووە, لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانین بڵێین گەیشتنی بەو پلەوپایە سیاسییە گرنگە لەنێو کوردو ناوچەکەدا, تەنها بەهۆی هەوڵەکانی خۆیەوە بووە, بەڵکو ئەو پلەو پایە وەك میراتێك بۆی بەجێمابوو ئەویش لەلای خۆیەوە پاراستوویەتیو گەشەی پێداوە، وەك چۆن باوباپیرانی کردوویانە, بۆیە شێخ مەحمود هەر لە منداڵیەوە جێگایەکی گرنگی لە دڵی هەمواندا داگیرکردبوو[4].

لە سەفەرەکەی شێ سەعیدی باوکیدا بەشداری کردووەو, دوور نییە هەر لەوکاتەوە لە پاش بینینی ژیانی سوڵتان عەبدولحەمید بیری پاشایەتیو دەسەڵات کەوتبێتە مێشکیەوە[5].

---

[1] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جز1، ب1، ل35. عبدالجبار حیدر: هەمان سەرچاوە، ص18.

[2] عبدالجبار حیدر: هەمان سەرچاوە، ص20.

[3] کریس کۆچیرا: هەمان سەرچاوە، ل117.

[4] خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقیدا: ل 16. عبدالجبار حیدر: هەمان سەرچاوە، ص18.

[5] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ1، ب1، ل 36.

## جوڵانەوە سیاسییەکانی شێخ مەحمود تا ساڵی 1922

زۆربەی سەرچاوەکان لەسەرئەوە کۆکن, سەرەتای رۆیشتنە ناوەوەی شێخ لە سیاسەتدا, لەو سەفەرەوە دەستیپێکرد کە لەگەڵ باوکیدا کردی بۆ ئەستەمبوڵ‌و چاوی بە دیوانی سوڵتان کەوت, هەروەك پێشتر باسمان کرد، پێدەچێت هەر ئەو کات بیری پاشایەتی‌و دەسەڵاتداری کەوتبێتە مێشکیەوە[1] ، شێخ لە سەفەرەکەیدا هەموو جۆرە پیاوانێکی لە دەوڵەتی عوسمانیدا بینی , گوێی بەدەنگی هاواری ئەو نەتەوانە زرنگایەوە کە داوای مافی خۆیان دەکرد لە دەوڵەتی عوسمانیدا[2] ، شێخ پەیوەندی بە چەند سەرکردەیەکی باکوری کوردستانەوە کرد, لەوانەوە زۆر گیروگرفت‌و هەستی نەتەوەیی‌و ئاواتو ئامانجیان شارەزابوو[3] .

لە کارەساتەکەی موسڵدا بەشداری کردووەو, لەپاش کوژرانی شێخ سەعیدو شێخ ئەحمەدی برای کەلەلایەن ئیتیحادییەکانەوە نەخشەی بۆ کێشرابوو, لێرەوە رێگا لەبەردەم شێخ مەحمودا کرایەوە, بۆئەوەی ببێت بەجێگری باوکی لە پلەی شێخایەتیداو سەرۆکایەتی کوردەکانیش بکات بۆ بەدەستهێنانی مافی خۆیان[4] ، لە گەڕانەوەیدا بۆ سلێمانی پێشوازییەکی بێ سنورکراو شیوەنێك بۆ شەهیدەکان تازەکرایەوە[5] ، ئیتر گەلی کورد دورو نزیك شێخ مەحمودیان بە جێگری هەموو بنەماڵی کاك ئەحمەدی شێخ‌و سەرداری وڵات دادەنا.

ساڵی 1914 دەوڵەتی عوسمانی چووە ناو جەنگی یەکەمی جیهانییەوە, ئەم جەنگە کوردستانیشی گرتەوە, چونکە بەشێك بوو لە دەوڵەتی عوسمانی, دروشمی هاوپەیمانەکان کەدەیان وت ئێمە رزگارکەرین نەك داگیرکەرلەگەڵ چواردە بەندەکەی (وڵسن)[6] ی سەرۆکی ئەمریکا, کەبەدانی مافی چارەنووس بەگەلانی ژێردەستە سەرنجی زۆربەی گەلانی بۆلای خۆی راکێشا, خەڵی باشووری کوردستانیش بەسەرکردایەتی شێخ مەحمود بیریان لەسەربەخۆیی کردەوە, عوسمانیەکانیش لەوکاتەدا لە فێڵ‌و تەڵەکەی خۆیان نەکەوتن, کاتێك ئینگلیزەکان لە باشوورەوە هێرشیان کردە سەر عێراق‌و شاری بەسرەیان داگیرکرد, پیاوە سیاسییەکانی عوسمانی پەنایان بردە بەر ژمارەیەك لە پیاوانی ناوداری عێراق‌و کوردستان, لە پێشەنگیان پێشەوای ئایینی شێخ مەحمود بوو[7] ، شێخ مەحمود بە لەشکرێکی کوردی هەزار کەسییەوە بەهانای عوسمانیەکانەوە رۆیشت، بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئینگلیزەکان, کە دیارە فاکتەری ئایینی پاڵی پێوەنابوو[8] بەشداری شەڕی شوعەیبە بکات, بەڵام پاش ئەوەی تورکەکان بە شکاوی لە شەڕەکەدا پاشەکشەیان کرد, شێخ مەحمودیش گەڕایەوە بۆ سلێمانی[9] .

---

[1] علاءالدين سجادي: شۆڕشەکانی کوردو کوردو کۆماری عێراق، چ معارف، بەغداد، 1959، ل79. یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 18. خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقیدا: ل 18–19.

[2] سجادی: شۆڕشەکانی کورد، ل79. شكري محمد نديم: أحوال العراق في المرحلة المشروطية الثانية 1908–1918، رسالة دكتورا، تقدم الى مجلس كلية الأداب جامعة بغداد، مايس 1985، ص286.

[3] هەرچەندە بۆچوون جیاوازە دەربارەی ئەم سەفەرە لەلایەن ساڵەوە، بەڵام مامۆستا عەلادین سوجادی دەڵێ ساڵی 1908 بووە.

[4] عبدالرزاق الحسني: تأريخ الوزارات، ج 1–2، ص257–258.

[5] خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقیدا: ل 19. رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ1، ب1، ل 45–46.

[6] بۆ زیاتر شارەزابوون لە بەندەکانی وڵسن بگەڕێوە عبدالوهاب القيسي: تأريخ العالم الحديث 1914–1945، ط1، جامعة بغداد، كلية التربية، 1983، ص46.

[7] یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 25.

[8] خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقیدا: ل 20. رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ1، ل49.

[9] یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 25.

دواتر شێخ بەناوی جیهادەوە لە ناوچەی پێنجوێن رووبەڕووی رووسەکان بوویەوە[1] , لەم شەڕەدا شێخ مەحمود ئازایەتییەکی زۆری نواندو پاشەکشەی بە رووسەکان کرد لەو ناوچەیە[2] ، ئەم رووداوە لە ساڵی (1917)دابوو, بەمەش شێخ زیاتر ناوبانگی دەرکرد, بەڵام بەهۆی هەڵوێستی خراپی عوسمانیەکان بەرامبەر بەخۆیو لایەنگرەکانی گەڕایەوە بۆ سلێمانی نارەزایی خۆی بەرامبەریان دەربڕی[3] .

کاتێك ئینگلیزەکان سوپاکەیان پێشڕەوی کردو گەیشتە شاری کەرکوك, شێخ مەحمود بەنهێنی نامەیەکی نارد بۆ وڵسنی حاکمی گشتی عێراق0 لە ساڵی (1918)دا, لە نامەکەدا شێخ داوای لێکرد کە یارمەتی بدەن بۆ دامەزراندنی حکومەتێکی کوردی لە سلێمانی لە ژێر چاودێری خۆیاندا (ئینگلیز)[4] ، تورکەکان پاش ئەوەی بەم نامەیان زانی شێخیان گرتو لە رێکەوتی (1918/8/30)دا حوکمی لەسێدارەدانیاندا بەسەر شێخدا, بەڵام لەبەر بەرژەوەندی سیاسی خۆیان گەڕاندیانەوە بۆسلێمانیو کردیان بە فەرمانڕەوای شارەکە[5] ، دواتریش بۆ زیاتر رازیکردنی شێخ نازناوی (نقیب)یان پێ بەخشی, ئیتر لەوکاتەوە بوو بە شێخ مەحمودی نەقیب[6] .

کاتێك کە جەنگی یەکەمی جیهانی کۆتایی هات، بەپێی پەیماننامەی مۆدۆروس ئاگربڕی جەنگ راگەیەنرا, عەلی ئیحسان پاشای والی تازەی ویلایەتی موسڵ، بۆ زیاتر راکێشانی شێخ بۆلای دەوڵەتی عوسمانی, فەرمانیدا بەموتەسەریفی سلێمانی کە بەرێوەبردنی ناوچەکە بداتە دەست شێخ مەحمود, شێخ بەناوی حکومەتی عوسمانیەوە بوو بە موتەسەریفی سلێمانی[7] ، شێخ مەحمود ویستی سوود لە کات وەرگرێت بۆیە کە بوو بە موتەسەریفی سلێمانی دووبارە نامەیەکی نارد بۆ ئینگلیزەکانو داوای سەربەخۆیی لێکردن, بەپێی چەند مەرجێك بێنە سلێمانییەوە, ئەوانیش قبوڵیان کرد[8] . بۆ ئەم مەبەستە وڵسنی حاکمی گشتی ئینگلیز لە عێراق, (مێجەر نۆئێل)[9] ی وەك نوێنەری خۆی نارد بۆ سلێمانی, لە (1918/10/16)دا نۆئێل دوای گەیشتنی بەشار، لەبەردەرکی سەرای شاری سلێمانیدا شێخی وەك حوکمداری کوردستان ناساند[10] ،

بەڵام ئەم پەیوەندیەی نێوان شێخو ئینگلیزەکان زۆری نەخایاند, چونکە ئینگلیزەکان لای خۆیانەوە هەوڵیاندەدا سنورێك بۆ دەسەڵاتی شێخ دابنێن[11] ، بۆیە (مێجەر نۆئێل) کە نوێنەری ئیگلیز بوو لە حکوتەکەی شێخ مەحموددا,

---

[1] (پێنجوێن) شارۆچکەیەکی سەر بە پارێزگای سلێمانییە، نزیك سنووری کوردستانی ئێران.

[2] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ1، ل50. خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقیدا: ل 20.

[3] علاءالدین سجادي: شۆڕشەکانی کورد، ل79–80.

[4] خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقیدا: ل 20.

[5] یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 26–27. خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقیدا: ل 21.

[6] خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقیدا: ل 23.

[7] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، ب1، ل57. علاءالدین سجادي: شۆڕشەکانی کورد، ل79. خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقیدا: ل 21.

[8] یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 26–27.

[9] (مێجەر نۆئێل) ئەفسەرێکی ئینگلیز بوو، ساڵی 1918 بە فەرمانی وڵسن هاتە سلێمانیو بوو بە راوێژکاری سیاسی شێخ. رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جز5، ل 519.

[10] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ1، ب1، ل60–61. عبدلرزاق الحسني: تأريخ العراق السياسي الحديث، ج3، (ب.م)، 1948، ص248–249.

[11] عبدالرزاق الحسني: تأريخ الوزارات، ص263. عبدالرزاق الحسني: تأريخ العراق السياسي الحديث، ج3، ص248–249. خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقیدا: ل 15.

تاڕادەیەك لەگەڵ شێخدا نەرم بوو، گۆڕاو (مێجەرسۆن)[1] یان لە شوێنی داناو کردیان بە ڕاوێژکاری سیاسیی شێخ لە سلێمانی, مێجەرسۆن هەر لە سەرەتاوە کەوتە پیلانگێڕان دژی شێخو دەسەڵاتەکەی[2]، شێخ کەهەستی بەمە کرد بە هاوکاری (مەحمودخانی دزڵی)[3] لە (23/مایسی/1919) دەستی بەسەر شاری سلێمانیدا گرتو ئاڵای ئینگلیزی داگرت, لە راستیدا ئەم ڕووداوە لێدانێکی کوشندە بوو لە هەیبەتی ئینگلیز درا, بۆیە ئینگلیزەکان بە پەلە کەوتنە هەوڵی دامرکاندنەوەی شۆڕشەکە,[4] لەم پێناوەدا هەموو هێزێکیان بەکارهێناو لە پاش چەند رۆژێك لە بەرەبەیانی (18/حوزەیرانی/1919)داو لە شەڕی (دەربەندی بازیان)[5] دا کۆتاییان بە شۆڕشەکەی شێخ هێنا, شێخیان لە شەڕەکەدا بەبریندار دەستگیرکرد.

شێخ مەحمود لە دادگایەکی سەربازیدا لە بەغداد لەلایەن ئینگلیزەکانەوە حوکمی لە سێدارەدانی بەسەردا سەپێنرا,بەڵام دواتر پەشیمان بوونەوەو حوکمەکەیان گۆڕی بە (10) ساڵ زیندانیو دەستبەسەری رەوانەی هیندستانیان کرد، تا ساڵی 1922شێخ لەوێ مایەوە[6].

### بارودۆخی سیاسیی سلێمانی پاش دورخستنەوەی شێخ مەحمود

شێخ مەحمود پاش ئەوەی لە (18/حوزەیرانی/1919) بەرامبەر بە هێزی ئینگلیزەکان لە شەڕەکەی دەربەندی بازیاندا شکستی هێنا, بەهۆی نا بەرامبەری هێزەکانو ناپاکی چەند کوردێك, بەبریندار بەدیل گیرا, پاشان رەوانەی هیندستا کرا[7]، ئینگلیزەکان گەڕانەوە سلێمانیو لە جیاتی ئەوەی لەگەڵ دانیشتواندا پەیوەندی بەهێزبکەن بەپێچەوانەوە کەوتنە سزادانی خەڵکی, بەتایبەتی ئەوانەی کە لایەنگری شێخ بوون لە سلێمانیو لە دەرەوەی شاردا[8].

ئینگلیزەکان هێزێکی تایبەتیان لە سلێمانی دانا، ماوەیەك خەریکی گرتنی ئەو سەرۆکانە بوون کە لایەنگیری شێخ بوونو گەلێکیشیان لێ جەریمەکردن[9]، گەلێك موچەخۆرو دەرەبەگی سەربەخۆیان لە دەزگاو دائیرە میرییەکاندا دامەزراند، کە پەیوەندی راستەوخۆیان بە حاکمە سیاسیەکانی ئینگلیزەوە هەبوو، لەسەروویانەوە مێجەرسۆن کە بوویوو بە حاکمی گشتی لە سلێمانی، ئینگلیزەکان یارمەتیەکی زۆریشیان بەناو هەندێك لە ئاغاکانی پشدەرو سەرگەڵوو سەنگاودا دابەشکردبوو، کە بووبوون بە لایەنگیریان، بەئومێدی ئەوەی ئەوانی تریش ببن بە لایەنگریان.

---

[1] (مێجەرسۆن) ئەفسەرێکی ئینگلیزی بوو لە پاش مێجەر نۆئێل بە بڕیاری مەندوبی سامی لە بەغداد بوو بە راوێژکاری سیاسی شێخ. خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقیدا: ل 40.

[2] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ1، ب1، ل86.

[3] (مەحمودخانی دزڵی) کوڕی عەزیزبەگی بارام بەگە، ساڵی 1780ز لە گوندی دزڵی سەر بە شاری مەریوان لە کوردستانی ئێران لەدایك بووە، سەرکردەی هەورامییەکان بووەو پەیوەندی لەگەڵ شێخدا پتەوبووەو خۆی بە سەربازی ئەو داناوە. عومەر مارف بەرزنجی: مەحمودخانی دزڵیو لاپەڕەیەك لە مێژووی کورد، رۆژی کوردستان، ژ4، حوزەیران 1973، ل41–42.

[4] قاسم خلف عاصي الجميلي: العراق والحركة الكمالية، 1919–1923، رسالة دكتوراه، كلية الأداب، جامعة بغداد، أيلول 1990، ص114.

[5] (دەربەندی بازیان) دەربەندێکە دەکەوێتە سەرووی سلێمانییەوەو لە مێژوودا بە هێڵی بەرگری سروشتی ناسراوە، بۆ پارێزگاری لە لیوای سلێمانی، هەر لەشکرێك لێرەوە سەرکەوتوو نەبووبێت نەیتوانیوە سلێمانی بگرێت.

[6] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ1، ب1، ل169–171. خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقیدا: ل 31–32.

[7] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ1،ب1، ل168–169. خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقیدا: ل 32–33.

[8] خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقیدا: ل 34.

[9] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ1، ب1، ل 171.

فەرماندە سیاسیەکانی سلێمانیو هەڵەبجەو بێجیو دووزخورماتوو و خانەقینو موسڵ لە هەموو ئیشوکارێکدا پرسو ڕایان بە مێجەرسۆن دەکرد[1].

مێجەرسۆن کە بەرپرسی تێکدانی دەسەڵاتەکەی شێخ بوو، کاتێك گەڕایەوە بۆ سلێمانی, دەستیکردەوە بە ئاژاوەگێڕانو تاڵانو بڕۆی خەڵکیو بەندکردنیان[2]، هەمووماڵەکانی بنەماڵەی شێخان بەفەرمانی ئەو تاڵانکران, زەویو زاریان خرایە ژێردەست کاریەدەستانی خۆیەوە, دۆستو نزیکەکانی شێخ دەربەدەرکرانو سزادران[3].

کردەوەکانی مێجەرسۆن بەرامبەر بە پیاوە ناودارەکانی کورد, زۆر بێبەزەییانە بوو, لەگەڵ ئەم تاوانانەدا دەیانویست دڵی خەڵکی بدەنەوە, ئازوقەو پارەیەکی زۆریان بەسەر زۆریەی خەڵکی بێدەرەتانی شاردا دابەش دەکرد[4]، خەریك بوو ڕێگاکانیان ڕێکدەخستو هەندێ ڕێگاشیان نوێ کردەوە, بەڵام ئەمانە زیاتر مەبەستی سیاسیو بەرژەوەندی خۆیانی لە پشتەوە بوو[5]، یەکەم کەس بوو فەرمانیدا ڕۆژنامەیەك بە کوردی لە سلێمانی دەربچێت بە ناوی (پێشکەوتن)[6]ەوە, ئەنجامی ئەم سیاسەتانەی ئینگلیز بوو بەهۆی پەیدابوونی ئاژاوە لە کوردستاندا[7]، جگە لەوەش پەیڕەوی سیاسەتە بەناوبانگەکەی خۆیان (پەرتکەو زاڵبە)ی دەکرد.

لەبەرئەوە نەیارانی ئینگلیز لە سلێمانیدا بەرەو زیادبوون دەڕۆیشتن, بەڕادەیەکی وا کە زۆر لە وانەی لەوەوپێش لە دەرپەڕاندنی تورکدا بەشدارییان کردبوو، چاوەڕێی هەلێکیان دەکرد ئەمجارە ئینگلیز لە سلێمانی دەرپەڕێنن[8]. ئەوەبوو دوو پارتی سیاسی کوردی دروستبوونو لە بەرەیەکی یەکگرتوودا یەکیانگرتو خەڵکێکی زۆریش بوونە لایەنگریان, یەکەمیان (پارتی نیشتیمانی کوردی)و دووەمیان (پارتی ئیسلامی کوردی) دژی ئینگلیز بوو[9].

پاش هەوڵدانی هەردوو پارتەکەو پەیوەندیکردنو ڕاوێژکردن, ئەمەش بوو بەهۆی زیادبوونی ناڕەزاییو بەردەوامبوونی لە ناوچەکانی کوردستاندا, ئەوەبوو لە ناوچەکانی پشدەرو ڕانیە هۆزەکان پەلاماری ئینگلیزەکانیانداو ژمارەیەکی زۆریان لێکوشتن[10]، (هەمەوەندەکان)[11]یش لە ناوچەکانی چەمچەماڵو سەنگاوو قەرەداغ لە ئینگلیزەکان ڕاپەڕینو دوو زابتیان لێکوشتن، ساڵی 1922 لە ناوچەکانی هەورامانو مەریوان مەحمود خانی دزڵی قارەمانی شۆڕشی یەکەمی شێخ مەحمود سەری بەرزکردەوە[12].

---

1 یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 60.

2 ئەحمەد خواجە: چیم دی، ب3، بەغداد، 1968، ل53–54. خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقیدا: ل 40–41.

3 خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقیدا: ل 35.

4 یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 60.

5 ڕەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، ب1، ل 18.

6 (پێشکەوتن) ئەو ڕۆژنامەیە بوو کە لە پاش گەڕانەوەی مێجەرسۆن بۆ سلێمانی دەریکرد، بۆ مەبەستی پەیداکردنی لایەنگر بۆ ئینگلیزو شێواندنی ئایینو ڕەفتاری کوردەکان. کەمال مەزهەر: چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد، ب1، بەغداد 1985، ل155.

7 ڕەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، ب1، ل 20.

8 خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقیدا: ل 41.

9 دەربارەی ئەم دوو پارتە بگەڕێوە یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 79.

10 یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 79–80.

11 (هەمەوەند) خێڵێکی گەورەی ناوچەی چەمچەماڵو سەنگاوە، کەریم بەگی فەتاح بەگ سەرکردەیان بوو، خێڵێکی ئازا بوونو لە کاتی دوورخستنەوەی شێخ چالاکییان زۆر بوو. ڕەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، ب1، ل 31.

12 سجادی: شۆڕشەکانی کورد، ل93. ڕەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، ب1، ل 31.

رۆژ لە دوای رۆژ دژایەتی کرینی ئینگلیز لە ناوچەکانی کوردستان بەگشتیو لە ناوچەی سلێمانی بەتایبەتی لە پەرەسەندندا بوو. لەم هەموو ئاژاوەو کارەساتانەدا بۆمان دەردەکەوێت کە لە ساڵەکانی (1919-1921-1922) هەر لە پاش دوورخستنەوەی شێخ مەحمود، کوردەکان بۆساتێکیش نەوەستاونو بێووچان لە کارابوون، بۆ بەگژاچوونەوەی ئینگلیز[1]. هەر لەم کاتەشدا دەنگوباسێك بلاوبوویەوە گوایە لەشکرێکی توورك دێتو پەلاماری کوردستان دەداتو دەست بەسەر لیوای موسڵدا دەگرێت. ئەمەش لەو کێشە گرنگانە بوو کە لە نێوان تورکو کوردو عەرەبو ئینگلیزدا مابوویەوە[2]، بەیارمەتی هەندێك لە کوردەکانی سەرسنوور توانیان رەواندز بگرن، ئۆزدەمیر پاشا[3]، دەورێکی گرنگی بینی لە بلاوکردنەوەی پروپاگەندەی تورك لە ناوچەی رەواندز.

بەم شێوەیە ئینگلیزەکان گرفتاربوونو نەیاندەزانی لا بە لای کام کێشەدا بکەنەوە, بە لای شۆڕشو پێکدادانەکانی ناوخۆ، یان بە لای ئۆزدەمیردا، کە تەنگی بە ئینگلیزەکان هەڵچنیبوو[4].

لە سلێمانیش (مێجەرسۆن)ی حاکمی گشتی کە هەستی بەم مەترسیانە کرد شارەکەی بەجێهێشتو دوو جیگری بۆ خۆی دانا, کابتن بۆندو مێجەر ماکانت بوو بەڕاوێژکاری ئەو, کە زۆر هەڵسوکەوتیان خراپ بوو لە گەڵ دانیشتواندا. لە ئەنجامدا بەهۆی ئەم هەڵسوکەوتەیانەوە هەروەك ئاماژەمان بۆکرد لەلایەن هەمەوەندەکانەوە کوژران[5]. بەرامبەر ئەم بارودۆخە نوێیە لەسەر ئینگلیزەکان پێویستبوو کە هەڵوێستی خۆیان بگۆڕن بەرامبەر بەکوردستان.

## هۆکاری گۆڕانی سیاسەتی بەریتانیا و عێراق بەرامبەر شێخ مەحمود

پاش دوورخستنەوەی شێخ بۆ هیندستان, ئینگلیزەکان ویستیان ئیدارەیەکی تایبەت بۆکورد دامەزرێننو بەم جۆرە کۆتایی بەئاژاوەو شۆڕش بهێنن[6]، چونکە بزوتنەوەی رزگاریخوازی نیشتمانی, پاش دوورخستنەوەی شێخ رانەوەستاو بەردەوام بوو, بەلکوکۆمەڵەی سیاسیشیان دروستکرد وەك جەمعیەتی کوردستان[7].

بەتایبەتی پاش هاتنی (ئۆزدەمیر) بۆ رەواندزو بلاوبوونەوەی پروپاگەندەی سیاسی, سەبارەت بەگەڕانەوەی شارەکانی سلێمانیو هەولێرو کەرکوك بۆ ژێر دەسەلاتی تورك, بەهۆی خێرایی گەیشتنی یارمەتی سەربازییەوە[8].

---

[1] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، ب1، ل 31.

[2] یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 80.

[3] (ئۆزدەمیر پاشا) بە رەگەز میسری بوو، یەکێك بوو لەو ئەفسەرە تورکانەی لە بەرەکانی جەنگی عینتاب لە دژی فەرەنسییەکان ئەجەنگا، لە کاتی خۆیدا روتبەی قائیمقامی وەرگرتبوو. خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقیدا: ل 62-63.

[4] سجادی: شۆڕشەکانی کورد، ل93. درك کیذان، کوردهاو کردستان، (ت: ابراهیم یونسی)، چ أول، 1372 (1993)ز، ل93-94.

[5] یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 80.

[6] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، ب1، ل 44.

[7] (جەمعیەتی کوردستان)، ئەم جەمعییە تە موستەفا پاشای یاموڵکی لە (1922/7/21) لە سلێمانی دروستیکرد، بەمەبەستی رووبەڕووبوونەوەی پروپاگەندەکانی تورکو بزواندنی هەستی کوردەکان بەرامبەر بە سەربەخۆیی، پاشان بڕیاری دەرکردنی رۆژنامەیەکیشیدا بە ناوی (بانگی کوردستان). رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، ب1، ل 486.

[8] حامد محمود عیسا علی: المسألة الكردية في الشرق الأوسط منذ بدايتها حتى 1991، م. متبولي، (ب.م)، 1992، ص133-134.

دەرچونی پەیمانی (سیڤەر)[1] دەوری کاریگەری هەبوو لە گۆڕانی هەڵوێستی بەریتانیا بەرامبەر بە کوردستان, چونکە تاڕادەیەك مافی کوردی تیادا رەچاوکرابوو, بەپێدانی ئۆتۆنۆمی بە کوردستان, بەتایبەتی دەوڵەتی بەریتانیا تێبینی ئەوەی کرد کە کەمالیەکان لە تورکیا سەرکەوتنی گەورەیان بەسەر دوژمنەکانیاندا بەدەستهێناوە[2] و هیوایان بەژیان هێناوە, گەڕانەوە سەر مەسەلەی موسڵ, چونکە بەتەواوەتی دەستیان لێ هەڵنەگرتبوو[3]، حکومەتی بەریتانیاش بەرامبەر بەداواکارییەکانیان کارتی کوردی بەدەستەوەبوو, واتە جارێکی تر بیری لە دامەزراندنی حکومەتێکی کوردی کردەوە, چونکە ئینگلیزەکان بیریان لە دامەزراندنی حکومەتیکی کوردی نەدەکردەوە کە لەسەر زەوی خۆیان بێت (واتە: باشوری کوردستان) بەڵکو لەسەر زەوییەك کە تورکیا دەستی بەسەرداگرتووە[4].

دەربارەی بارودۆخی عێراقیش پاش شۆڕشی بیست[5]، ئینگلیزەکان لە بارودۆخێکی خراپدابوون, چونکە رای گشتی ئینگلیزەکان گەشتبووە رادەیەك کە سەربازەکانیان پاشەکشە پێبکەنەوە بۆ وڵاتەکەیان, چونکە پاش جەنگی جیهانی بوو, لە هەمانکاتدا پێویستیان بەژمارەیەکی زیاتری سەرباز هەبوو بۆ کۆنترۆڵکردنو پاراستنی ئاسایشی عێراق, کە ئەوکات ئینگلیزەکان حکومەتێکیان تیادامەزراندبوو, (مەلیك فەیسەڵ)[6] یان کردبوو بەمەلیکو سەرپەرشتیاری ئەو وڵاتە[7].

لە بەرئەوە ئینگلیز بە ناچاری رێگای نزیکبوونەوە لە بزوتنەوەی نیشتیمانی کوردی هەڵبژارد, بۆ کوردێك دەگەڕان کە لەگەڵ سیاسەتی خۆیاندا بگونجێت, بەتواناو خاوەن نفووس بێت, کە کوردەکان باوەڕی پێبکەن,[8] لەو کاتەدا داواکارییەکانی (سەید تەها)[9] لەلایەن مەندوبی سامییەوە رەتکرایەوە.

پاش ئەوەی لە سەید تەها بێهیوا بوون, زانیان کە بەڕێوەبردنی سلێمانی لەلایەن مێجەرسۆنەوە هیچ سوودی نییە, لەبەرئەوە بۆ یەکێکی تر دەگەڕان, کە ئەو کەسە بەرژەوەندی خۆی زیاتر لامەبەست بێ وەك لە ئامانجەکانی نەتەوەکەی,

---

[1] لە (1920/8/10) هاوپەیمانەکان بەهۆی روودانی شۆڕشی کۆمۆنیستی لە رووسیاو نزیکبوونەوەی کوردەکان لە کەمالییەکانەوە لەگەڵ تورکیادا بەستیان. مەحمود موحەممەد بێرێژی: ئاکامەکانی جەنگی جیهانی یەکەم، گ. رامان، ژ 20، 1998/2/5.

[2] لەنێوان سالانی (1921– 1922) حکومەتەکەی مستەفا کەمال هەڵوێستی بەهێز بووبوو، چونکە بەرامبەر هەموو پیلانو شۆڕشەکان وەستا کە نەیارانی لە ناوەوەو دەرەوە دەیانگێڕا، وەك لایەنگرانی خەلیفە لە ئەستەمبوڵ، یۆنان لە ئەنادۆڵو راقیا، فەرەنسییەکان لە کیلیکیا، ئەرمەن لە ئەریوان. رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جز5، ل 498–499.

[3] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جز5، ل499.

[4] جورج حجار: سات والمسألة الكردية، ص15.

[5] (شۆڕشی بیست) ئەو شۆڕشە بوو کە لە (30/حوزەیران/1920) لە عێراقدا هەڵگیرسا دژی سیاسەتی توندوتیژی ئینگلیز، شۆڕشەکە لەلایەنی سیاسییەوە سەرکەوتوو بوو. حسین جمیل: هەمان سەرچاوە، ص53.

[6] (مەلیك فەیسەڵ) کوڕی شەریف حسینی حیجازەو بەشداری جەنگی رزگارکردنی حیجازی کرد دژی عوسمانییەکان، لە پاداشتی ئەوەدا هاوپەیمانەکان لە تشرینی یەکەمی 1918 کردیان بە مەلیکی سوریا، پاش کۆنگرەی سانرێمۆ 1920، سوریا کەوتە سەر فەرەنسا، بۆیە لە سوریا دەرکراو بەریتانیا لە (23/ ئاب/1921) کردی بە مەلیکی عێراق. رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ1، ب2، ل186–187.

[7] ئینگلیز لە (12/مارس/1920) لە کۆنگرەی قاهیرەدا بڕیاری دامەزراندنی حکومەتێکی نەتەوەیی بۆ عێراق دەرکرد. حسین جمیل: هەمان سەرچاوە، ص53.

[8] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، ب1، ل44.

[9] (سەید تەها) خەڵکی شەمزینانەو لە کاتی دوورخستنەوەی شێخ مەحمود کەسایەتییەکی گەورەی هەبوو، ئینگلیز ویستی وەك داردەستێك بەکاری بێنێت، بەڵام رێکنەکەوتن.

بۆئەم مەبەستەش هیچ کەسیان لە (حەمدی بەگی بابان)[1] بە شیاوتر نەدەزانی, ئینگلیزەکان هیوایەکی زۆریان پێی بوو کە ماوەیەك ناوی کەوتبووە سەرناوان, بەلاَم ئەویش لە تاقیکرنەوەکەیدا سەرکەوتوو نەبوو[2].

بارودۆخەکە زیاتر بەرەو گرژبوون دەرۆیشت, بەتایبەتی خەڵکی سلێمانی لە دوورخستنەوەی شێخ مەحمود زۆر دلگرانو دلّ بریندارببوونو هەر رۆژەی لە لایەکەوە رووداوێك روویدەدا, بەتایبەت لە لایەن لایەنگرانی شێخ مەحمود کە تا ئەوکاتەش سەریان بۆئینگلیزەکان شۆرنەکردبوو, هەر بەشاخەوە بوون[3].

بۆیە هەردوو حکومەتی بەریتانیاو عێراق بیریان لە دامەزراندنی حکومەتێکی کوردی کردەوە, بەتایبەتی دەسەلاَتدارانی بەریتانی بریاری گێرانەوەی شێخ مەحمودیاندا بۆسلێمانی, چونکە لەو کاتەدا بەریتانیەکان تەکبیری لەمە باشتریان بەخەیالّدا نەدەهات, حکومەتی ساوای عێراق هێشتا بەرێوەبردنی کوردستانی بەتایبەت سلێمانی نەدرابوویە دەست، چارەنووسی ئەم هەرێمە بەدەست مەندوبی سامییەوە بوو, چونکە حکومەتی عێراق هێشتا نەگەیشتبووە ئاستێك کە سەرەرای کاروباری خۆی دەست بۆ کوردستانیش درێژ بکات[4]، لە لایەکی ترەوە بۆئەوەی وەك کارتێکی فشاریش بەدەستیەوە بێت بەرامبەر بەحکومەتی عێراقی، بۆ ئەوەی بەپێی بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا بجولێتەوە[5].

چەند فاکتەرێکی تر هەبوون کە وایکرد ئینگلیزەکان هەلّوێستی خۆیان بەرامبەر بە کوردستانو شێخ مەحمود بگۆرن, لەوانە خۆرزگارکردن لەو ماندویەتییەی کە شۆرشە کوردییەکان دروستیانکرد, وەك هەلّگیرسانی شۆرشی پشدەرییەکان لە رانیە[6]، کوشتنی چەند حاکمو نوێنەرێکی سیاسیو سەربازی ئینگلیز لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستاندا, تا ئەوکاتە هیچ بریارێك لە لایەن (کۆمەلّەی گەلان)ەوە سەبارەت بە ویلایەتی موسلّ دەرنەکرابوو[7]، بەریتانیا دەیویست زووتر لە ژێرباری پێویستیەکانی سوپاکەیدا بێتەدەرەوە[8].

فاکتەری ئابوریش رۆلّی خۆی هەبوو, چونکە ئیدارەی ولاَتو کوژاندنەوەی ئەو شۆرشانە گران دەکەوت لەسەر خەزێنەی بەریتانیا[9].

جگە لەوانەش ئیتر کاتی ئەوە هاتبوو لە لایەن ئینگلیزەکانەوە لەگەلّ ئۆزدەمیردا حساب ببرنەوە, دەبوو هێزە بچووکەکەی تورك لە شاری رەواندز بکەنەدەرەوە, کۆتایی بەپروپاگەندەکانی ئۆزدەمیر بهێنن, لەبەرئەوەی باری ئابووری بەریتانیا رێگای نەدەدا بە لەسەرخۆیی ئەم کارە برواتە پێشەوە، بۆیە بۆ دەرپەراندنی هێزەکەی ئۆزدەمیر شێخ مەحمودیان گەراندەوە بۆ سلێمانی[10].

---

[1] (حەمدی بەگی بابان) هەرچەنە لە بنەمالّەی بابانەکان بوو، مرۆڤێکی رۆشنبیر بوو، بەلاَم زمانی دایکی خۆی نەدەزانیو سەختی ژیانی نەدیبوو، شارەزای ولاَتی باوباپیری خۆی نەبوو، بۆیە خەلّکی سلێمانی ئامادەنەبوون شێخ مەحمودی خاوەن مێژووو ئەزموون بگۆرنەوە بە حەمدی بەگی بابان. رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، ب1، ل 99–100.

[2] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، ب1، ل 91–92.

[3] سجادی: شۆرشەکانی کورد، ل93–94. ستیظن سي بلتیر: الأكراد عنصر الأضطراب، (ـ: سەعدون موحەممەد)، (ب.ش، ت.س)، ص67–68.

[4] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جز5، ل 499.

[5] مەحمود موحەممەد بیریژی: (گ. رامان)ـ هەمان سەرچاوە. عبدالرزاق الحسني: تأريخ العراق السياسي، ج3، ص286.

[6] حامد محمود عیسی علي: هەمان سەرچاوە، ص133–134.

[7] یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 81.

[8] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جز5، ل 500.

[9] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جز5، ل 500.

[10] ئەحمەد خواجە: هەمان سەرچاوە، ل125–126.

چونكه بەریتانییەكان لەسەر زاری (سێر پرسی كۆكس)[1] ەوە بیروباوەڕی بەوە نەبوو كە بەهێزی نیزامی سلێمانی بگەڕێتەوە ژێر دەسەلاتی, پێی وابوو بە گێڕانەوەی شێخ مەحمود كوردەكان لە دەوری شێخ كۆدەبنەوە, بۆ دەركردنی توركەكان لە ناوچەكەیان قۆڵی لێهەڵدەماڵن[2] .

ئەمانەو جگە لەوەی كە ژمارەی ئەوانەی كە داوای گەڕانەوەی شێخیان دەكرد رۆژبەرۆژ لەزیادبووندا بوو, ئەمە بوو بەداواكارییەكی گشتیو لە لایەن زۆربەی چینو توێژەكانی خەڵكیەوە پشگیری لێدەكرا[3] .

[1] (سیر پرسی كۆكس) مەندوبی سامی بەریتانی بوو لە بەغداد.

[2] كریس كۆچیرا: كورد لە سەدەی نۆزدەو بیست، (و: محمد ريّاني)، تهران، 1990، ل116.

[3] أز/. منتشا شغيلي: العراق في سنوات الأنتداب البريطاني، ". جامعة بغداد، 1978، ص317.

## گەڕانەوەی شێخ و پێشوازیکردنی لە سلێمانی

پاش ئەوەی هەردوو حکومەتی بەریتانی‌و عێراقی گەیشتنە ئەو بڕوایەی کەهیچ ڕێگایەك نییە پەنای بۆبەرن جگە لە گەڕاندنەوەی شێخ مەحمود, کەوتنەوە پەیوەندیکردن پێوەی, ئەوەبوو بەبیانووی ناسازی ئاووهەوا لە هیندستانەوە گواستیانەوە بۆ کوێتو لە عێراق نزیك خرایەوە[1].

لە کوردستانیش پیاوە سەربازی‌و مەدەنییەکان بڕیاریاندا لە ڕێکەوتی (1922/9/5) لە دەشتی وەیسدا, کۆبوونەوەیەك لەگەڵ ئەشرافو پیاوماقوڵەکانی شاردا ئەنجام بدەن, حاکمی سیاسی ئینگلیز (مێجەرسۆن) لە بەشێکی وتارەکەیدا لەو کۆبونەوەیەدا وتی: "بۆئەوەی ساردی لە نێوانماندا نەمێنێت, حکومەتی خاوەنشکۆ بڕیاریدا سلێمانی بەجێبهێڵێت, گەلی کورد خۆی دەزگایەکی حکومداری دامەزرێنێت, بەهیوای ئەوەی سەربەخۆیی‌و ڕزگاریتان لە ماوەیەکی کەمدا دیاری بکرێت"[2].

لە هەمووولایەکەوە دەست بەرزبوویەوە, چەپڵە لێدرا, پاشان نوێنەری کورد (مستەفا پاشای یامولکی‌و شێخ موحەممەد غەریب)[3], هەریەکەیان وتارێکیان خوێندەوەو داوای گەڕانەوەی شێخ مەحمودیان کرد, ڕوونیانکردەوە بەبێ شێخ حکومەتی کوردستان ڕوست ناکرێت. حاکمەکەش لە وەڵامدا وتی: "ئەم داواکارییەتان دەگەیەنمە شوێنی خۆی"[4].

مستەفا پاشای یامولکی‌و کۆمەڵەکە داوایان لە (مێجەرسۆن) کرد, کە ڕازی بێت شێخ قادر بکرێت بە جێگری شێخ مەحمودو ئیشوکارەکان بەڕێوەبەرێت تا ئەوکاتەی شێخ دەگەڕێتەوە.

حاکمی ئینگلیز (گۆڵدسمیث) ڕازیبوو, دواتر هەستاو پێی وتن لەسەر بڕیاری حاکمی گشتی ئینگلیز ئێمە ئیشوکاری شارەکە بۆخۆتان بەجێدەهێڵین, وەکیلی دیوانیشی دانێ.

پاش ئەوە فرۆکەکانی ئینگلیز دەستیان کرد بەگواستنەوەی مەدەنی‌وسەربازەکانیان, بۆ بەڕێوەبردنی شارەکەش ئەم کەسانە هەڵبژێردران: (مستەفا پاشای یامولکی, ئەحمەدبەگی تۆفیق بەگ, مەجید حاجی ڕەسوڵ بەگ, موحەممەد ئاغای حاجی ئەوڕەحمان ئاغا, شێخ موحەممەد گولانی) کە بەباشی ئیشوکاری خۆیان بەڕێوە دەبرد[5].

لە ڕێکەوتی (1922/9/5) کۆبوونەوەیەك بەسترا, مێجەر گۆڵدسمیث کلیلی دیوانو خەزێنەی دا بەشێخ قادر[6] تا شێخ مەحمود دەگەڕێتەوە, شێخ قادر دەستی بەدامەزراندنی دامودەزگای حکومەتی کوردستان کرد تا هاتنەوەی شێخ مەحمود, بەسەرپەرشتی خۆی کۆبوونەوەیەك بۆ پاراستنی شاری سلێمانی لە هەڵمەتی تورکو عەشایرو بۆبەرهەڵستی خرایەو جەردەیی کەوتە گفتوگۆ.

بەتایبەت لە لایەن (تورك خواکان)[7]ەوە, کە لەم کۆبوونەوەیە پەستبوونو دەیانویست ئاژاوەبنێنەوە, بەڵام تا بڕیار لەسەر (ئەنجومەنی میللی کوردستان) نەدرا بە سەرۆکایەتی شێخ قادر لە کۆبوونەوەکە هەڵنەستان.

---

[1] ڕەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جز5، ل 480–481. یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 82.

[2] یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 83.

[3] (شێخ موحەممەد غەریب) کەسایەتییەکی کۆمەڵایەتی بەرزبوو، لە کاتی حکومەتەکەی شێخ مەحموددا بوو بە وەزیری ناوخۆ. ڕەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جز6، ل 606.

[4] یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 83.

[5] یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 83.

[6] لێرەدا شێخ لەتیف دەڵێت: پاش هەفتەیەك لەو کۆبوونەوەیە شێخ قادر گەڕایەوە، بەڵام سەرچاوەکانی تر وەك ڕەفیق حیلمی‌و ئەحمەد خواجە سوورن لەسەر ئەوەی پێش ئەو ماوە لە 1/ئەیلول/ گەڕاوەتەوە.

[7] (تورك خواکان) ئەوانەن کە خۆیان بە تورك دەزانی، یان تورکیان خۆشدەویستو دژی ئینگلیزەکان بوونو بووبوون بە هۆی پەرەسەندنی پڕوپاگەندەی ئۆزدەمیرو بەرژەوەندییان لەگەڵ ئەو کۆبوونەوەیەدا نەبوو، بۆ زیاتر شارەزایی بگەڕێوە ڕەفیق حیلمی: ل482.

لێرەدا با بگەڕێینەوە بۆ لای شێخ مەحمود, لە ڕێکەوتی (1922/9/12) شێخ کوێتی بەجێهێشتو بەرەو بەغدا کەوتەڕێ، لە بەغداد چاوی بەحاکمی گشتی عێراق (وڵسن)و (مەلیك فەیسەڵ) کەوتو چەند کۆبوونەوەیەکیان پێکەوەبەست, بەهیوای دامەزراندنی حکومەتێ بۆ کورد, پەیمانی دامەزراندنی حکومەتێك بۆ کورد کە پایتەختەکەی سلێمانی بێت تەواوبوو[1]، وڵسن پەیمانی بەشێخ دا کە لە کۆمەڵەی گەلاندا, یارمەتی بدات, بەمەرجێك شێخ نەهێڵێت دەسەڵاتی تورك لە ناوچەکەدا بڵاوبێتەوەو پەرەبسێنێت[2].

لە بەغداد پاش کۆبوونەوەکان بڕیار درابوو, کە شێخ مەحمود ببێت بە (سەرۆکی ئەنجومەنی میللی), دواتر هەستیان بەوەکردبوو کە شێخ مەحمود ئەم ناونیشانەی بەدڵ نییە[3]، لەبەرئەوە بەناونیشانی(حوکمداری کوردستان)[5] گۆڕدرا.

لە سلێمانی لە ماڵی شێخ قادری (سەرۆکی ئەنجومەنی میللی) کۆبوونەوەیەکی گەورە ڕێکخرا، لە دوای گفتوگۆیەکی دوورودرێژ، بڕیار درا کە لە مزگەوتی گەورە کۆنگرەیەکی گشتی بگیرێتو بەشێوەکی ڕەسمی (ئاڵای کوردستان) هەڵبکرێ, ئەوەبوو بە بەشداری هەموو ئەندامانی ئەنجومەن, لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوان، بەخۆشیو شادیەوە ئاڵای کوردستان بەرەسمیو بەرێزەوە هەڵکرا[6].

پاشان شێخ قادری حەفیدو مستەفا پاشای یامولکی, کە ڕاوێژکاری شێخ قادر بوو, بڕیاری ئەوەیاندا, کە وەفدێك بنێرن بۆ پێشوازی شێخ مەحمود, وەفدی شاری سلێمانی بەسەرۆکایەتی شێخ قادر ڕێکخرا, لە ئەندامە ناسراوەکان مستەفا پاشا بوو, لەگەڵ هەندێك لە پیاوە ناسراوەکانی شاری سلێمانی[7].

پێش گەڕانەوەی شێخ مەحمود بەچەند ڕۆژێك, هەندێك لە ئەفسەرە کوردەکان[8] کە لە سوپای عێراقدا کاریان دەکرد, بە فەرمانی حکومەتو بۆ یارمەتیدانی شێخ مەحمود نێردرانەوە بۆ شاری سلێمانی, ئەمانە هەموویان چاوەڕوانی گەڕانەوەی شێخ بوون.

هەندێ لە ئەفسەرە لاوەکان لەم ماوەی چاوەڕوانییەدا, لە ناو خەڵکدا بەگشتیو لە ناو لاوەکاندا بەتایبەتی, هەستێکی بەتینی نیشتمانیو نەتەوەییان بڵاوکردەوە, مامۆستاو قوتابیەکانیش, لە ڕێکخستنی گۆرانی بەپیرەوەچووندا بوونو پرۆڤەیان لەسەردەکرد بۆ ڕۆژی گەڕانەوەی شێخ مەحمود[9].

پاش بڵاوبوونەوەی دەنگوباسی گەڕانەوەی شێخ مەحمود, لە هەموولایەکی کوردستانەوە پۆل پۆلو دەستەدەستە, خەڵکو عەشایر بە پیادەو بەسواری ڕێیان گرتبووەبەر ڕووەو بەغداد، تاکو کفری ڕۆیشتنو ڕێگاوبانەکان بە خەڵکی پڕچەك ڕازابوویەوە, پاش ئەوەی شێخ مەحمود لەگەڵ مێجەر نۆیلدا[10] گەیشتنە (کنگریان)، پێشوازی کەران لە سوارەی

---

[1] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جزء5، ل 506.

[2] یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 84–85. رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جزء5، ل507.

[3] یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 85.

[4] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جزء5، ل515.

[5] (حوکمدار) ئەم وشەیە واتاکەی نزیکە لە (رئیس الولایة) یان (حاکم الولایة)، یەکەمجار لە هیندستان بەکارهێنراوە، ئەم پلەیە مانای سەربەخۆیی تەواو ناگەیەنێت، هەندێك واتای سەلاحییاتی ئۆتۆنۆمی یان لامەرکەزی هەڵدەگرێت. عبدالجبار حیدر: المسألة الکردیة في الوثائق، ص113.

[6] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جزء5، ل512.

[7] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جزء5، ل513.

[8] وەك تۆفیق وەهبی، ئەمین ڕەواندزی، عەزیز قەزاز، فائق کاك ئەمین، لەگەڵ سدیق پاشا، کە بە فەرمانی مەندوبی سامی هاتبووە سلێمانی بەتەمابوو حکومەتی کوردستان لە ژێر چاودێری ئەودابێت. رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جزء5، ل515–516.

[9] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جزء5، ل516.

[10] (مێجەر نۆئێل) ئەفسەرێکی ئینگلیز بوو، کە لە ساڵی 1918دا هاتە سلێمانیو لە دەوری حکومەی یەکەمی شێخ مەحموددا راوێژکاری سیاسی شێخ بوو. رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جزء5، ل519.

هۆزەکان هەمووی دەورەی شێخ مەحمودیاندا, بە بەرزکردنەوەی دروشمو وتنی سروودی نیشتمانی لە دەوری شێخ کۆبوونەوەو شاردیانەوە[1].

دوای پێشوازی کردن, مستەفا پاشای یاملکی لە ناوجەماوەرەکەدا هەستاو وتارێکی گرنگی پێشکەش کردو خۆشحاڵی خۆیو گەلی کوردی نیشاندا بە هاتنەوەی شێخو گەڕانەوەی بۆ کوردستانو هێنانەوەی مژدەی سەرلەنوێ دامەزراندنەوەی حکومەتی کوردستان[2].

پاشان شێخ مەحمودو نوێنەرانی ماوەیەك لە کفری مانەوەو ئیسراحەتیان کرد. دواتر کۆبوونەوەیەکیان ئەنجامدا سەبارەت بە گەڕانەوەی شێخ مەحمود بۆ سلێمانی، لە ڕێگای کەرکوکەوە کە ئینگلیز بۆی دیاریکردووە, یان لە ڕێگای گەرمیانەوە, کە بەردەوام پاڵپشتی شێخ بوون. لە کۆتاییدا هاتنە سەر ئەوەی کە بە گەرمیاندا بگەڕێنەوە بۆ سلێمانی[3]، لە ڕێگادا پێشوازیەکی بێوێنەکراو چاوی بەهەندێك لە سەرۆك هۆزەکان کەوت, لە کۆتایی ئەیلولی 1922 هاتە دەریکەلەو پاشان هاتەوە سلێمانی, کە لەوکاتەدا دانیشتوان لە ئاهەنگی پێشوازیکردنی شێخدا بوون[4]، لە هەموو لایەکەوەو لە لایەن هەموو هۆزەکانەوە , وڵاتی سلێمانی بۆ هاتنەوەی شێخ بوویوو بەپوورەی هەنگو ڕۆڵێکی مێژوویی بوو لە ژیانی سلێمانیدا[5].

**دروستکردنی حکومەت و ڕاگەیاندنی مەلیکایەتیو بەیانی هاوبەشی هەردوو حکومەت**

پاش ئەوەی کە ڕێوڕەسمی پێشوازی تەواوبوو، شێخ وەك چاوەڕێ دەکرا، نەجوڵایەوەو ماوەی (10) ڕۆژ خۆی لە کەس نەگەیاند، پاشان هەرچەند زۆر دوودڵ بوو، لەسەر بڕیارێ نەدەوەستا، دیاربوو شتی زۆر لە دڵدا بوو, بەڵام نەیدەزانی لە کوێوەدەست پێبکات[6].

شێخ پاش ئەم ماوە دەستی بەدامەزراندنی وەزارەت کرد، لە سەرەتادا بەفەرمانی حوکمداری ژمارە (1), (1922/10/9) لەبەردەم ژمارەیەکی زۆری دانیشتواندا, لە شاری سلێمانی وتاری حوکمداری پێشکەش کرد, شێخ مەحمود لە سەرەتای وتارەکەیدا ئاواتی خۆشیو بەختیاری بۆ گەلی کورد خواستو دوورخستنەوەی ئەو سێ ساڵەی بۆ باسکردن[7].

پاشان لە ژێرناوی (ئەنجومەنی سەرۆکایەتی)دا (کابینە) واتە وەزارەت دانراو بەفەرمانی حوکمداری ژمارە (2) لە ڕێکەوتی(1922/10/10) حکومەتی کوردستان تەشکیلکرا, کەپێکهاتبوون لە:

1ـ شێخ قادری شێخ سەعید — سوپا سالار[8]

2ـ شێخ حەمە غەریب — ڕەئیسی داخلیە

3ـ عەبدولکەریم عەلەکە — ڕەئیسی مالیە

4ـ مستەفا پاشای یاموڵکی — ڕەئیسی معاریف

5ـ شێخ عەلی ئەفەندی قەرەداغی[9] — ڕەئیسی شەرعو عەدل

---

[1] (کنکریان) وێستگەی وەستانی شەمەندەفەرەو (4) میل لە کفرییەوە دوورە.

[2] حامد محمود عیسی علی: المسألة لكردية، ص135.

[3] یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: شۆڕشەکانی شێخ مەحمود، ل 85.

[4] یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 86.

[5] ڕەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جزء5، ل517. یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 88.

[6] سجادی: شۆڕشەکانی کورد، ل94.

[7] ڕەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جزء5، ل523.

[8] بۆ زیاتر شارەزایی دەربارەی ئەم وتارە بگەڕێوە یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 90. ئەحمەد خواجە: چیم دی، ب3، ل114.

[9] (سوپا سالار) بە مانای (قائد العام)، یان (رئیس الرؤساء) یان سەرۆك وەزیر دێت.

6- ئەحمەد بەگی فەتاح بەگ[1] رەئیسی گومرگ
7- سەید ئەحمەد بەرزنجی[2] رەئیسی ئەمنی عام
8- سدیق پاشای قادری موفەتیشی گشتی حکومەتی کوردستان
9- موحەممەدئاغای عەبدورەحمان ئاغا رەئیسی نافعە

هەر لەو رۆژەدا بەفەرمانێکی تایبەتی شاری سلێمانی وەك پایتەختی کوردستان ناسێنرا[3]، پاشان شێخ مەحمودی حەفید بەبۆنەی دامەزراندنی وەزارەتو راگەیاندنی سەربەخۆیی کوردستان, بەرامبەر ئەنجومەنی نیشتمانیو تارێکی بەپێزی خوێندەوە[4].

بەفەرمانی حوکمداری ژمارە (3) لە رێکەوتی (1922/10/15) هەموو کاروبارەکان رێکخرا, هەموو وەزیرەکانو دایەرەکان پێویست کرا لەسەریان کە بەشێوەیەکی رێكو پێك دەوام بکەن[5].

نوسینی دایەرەو دەرەوە بەکوردی دەستی پێکرد, پولی پێویست لێدرا, برنانەو مەرانە وەردەگیرا، پسووڵەی ئەدرا, عەشیرەتەکان لای خۆیانەوە بەم حکومەتە دڵخۆش بوون, بەڵام ئەوەندە هەبووئەم حکومداریە تەنها لە سنووری سلێمانیدا بوو[6].

شێخ مەحمود خۆی وادەردەخست زۆرگەورەترە لەوەی سەرکردەی هۆزێك بێت، بەتایبەتی کە رابردوویەکی نەتەوەییو نیشتمانی هەبوو, لە ناو ئێشو ئازاری نەتەوەکەیدا ژیابوو, بۆیە خۆی وادەبینی کە ئەو بۆ ئەوە هاتووەتەوە کە میللەتەکەی رزگار بکات. بۆیە خێرا، کە هەر لە رێگاوە دوو دڵ بوو، لەو رێککەوتنە سەرزارییەی کە لە بەغداد پێکهاتبوو[7]، ئینگلیزەکانیش بە هەمان شێوە هەستیان پێکردبوو لە کفری، بەڵام تازە کار لە کار ترازابوو، بەناچاری رازی بوو بە دانانی شێخ مەحمود وەك حوکمدار، پەیمانی ئەوەشی دایە کە لە وێنەیەکی فراواندا (خود موختارییەت بدرێت بە کوردستان)[8].

---

[1] هەرچەندە رەفیق حیلمیو عەلادین سوجادی دەڵێن حاجی سەعید کەرکوکی زادە وەزیری شەرعو عەدل بووە، بەڵام شێخ لەتیفو ئەحمەد خواجەو کریس کۆچیرا لەسەر شێخ عەلی ئەفەندی رێکن.

[2] (ئەحمەد بەگ) لەگەڵ بوونی وەزیری مالییەشدا خۆی هەر بە وەزیر دادەناو لەگەڵ هەیئەتی وەزیراندا دادەنیش، ئەمەش هەڵەی ئەو نەبوو، حکومەتەکە خۆی وا دارێژرابوو. رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جز5، ل525–526.

[3] (سەید ئەحمەد بەرزنجی) هەرچەند ئەم پلەیەی هەبوو، بەڵام لە هەیئەی رەئیسەکان نەدەژمێردرا، چونکە رەئیسی داخلییە کە بە مانای وەزیر دەهات، سەرپەرشیاری ئەمنییەتی گشتی بوو، لەبەر ئەوە راستر ئەوەبوو کە بە مدیری ئەمنییەت ناوببرێت. رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جز5، ل524–525.

[4] کریس کۆچیرا: کورد لە سەدەی نۆزدەو بیست، ل122–123.

[5] دەربارەی ئەم وتارە بگەڕێوە بۆ یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 91–92. ئەحمەد خواجە چیم دی، ب3، ل115.

[6] یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 94.

[7] سجادی: شۆڕشەکانی کورد، ل98. عەزیز شەمزینی: جوڵانەوەی رزگاری نیشتمانی، (و: ئەسەسەرد)، چ دووەم، ئەیلول 1985، ل112.

[8] لە بەغداد شێخ مەحمود لەگەڵ وڵسنو مەلیك فەیسەڵ لەسەر ئەمانە رێککەوتن:

1– دەرکردنی تورکەکان لە کوردستان، واتە پاراستنی عێراق لە تورك.

2– مەسەلەی موسڵ بۆ عێراق لەژێر ناوی کوردستان بۆ عێراق بهێڵێتەوەو باسی کەرکوكو هەولێریش نەکاتو سەر بە کوردستان نییە. (رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جز 5، ل531.

[9] رەفیق حیلمی: یادداش، بگ 2، جز 6، ل532–533.

بەڵام شێخ مەحمود ئاواتی زۆر لەوە گەورە تری هەبوو، بۆیە بەمانەوە نەوەستاو هەمووی مانگێکی پێنەچوو، لە کۆتایی تشرینی دووەم ناوی (حوکمداریشی) گۆڕی‌و نازناوی (مەلیکی کوردستان)[1]ی بۆ خۆی هەڵبژارد[2]، پاشان دەستیکرد بە اوا‌کردنی تێکڕای ئەو شارانەی کە کوردن‌و ئەکەونە خاکی کوردستانەوە[3]، ئاڵای کوردی بەرزکرایەوە کە مانگێکی سوور بوو لە پارچەیەکی سەوز لەگەڵ تاجێکی ڕەنگاوڕەنگ (مزخرف) جێگیر لەسەر ئاڵاکە، وەك جیاکەرەوەیەك لە هەموو ئاڵاکان[4].

بەرامبەر بەم بەپێشەوە پێشهاتو ڕووداوانە، کاردانەوە لە لایەن هەردوو حکومەتی بەریتانی‌و عێراقی ڕوویدا، ئەوەبوو بەیانێکیان لە (22/کانونی یەکەم/1922) دەرکرد، کە ئەمەش دەقەکەیەتی:

"هەردوو حکومەتی بەریتانی‌و عێراقی دان دەنێن بە ماف کورد، ئەوانەی کە لە سنووری عێراقدا نیشتەجێن‌و تیایدا دەژین، حکومەتێکی کوردی دروست بکەن، لە چوارچێوەی سنووری کوردستانی عێراق، هەردوو حکومەت رایانگەیاند کە بە ئاواتن ڕەگەزە کوردییەکان بە جیاوازی دەستەو تاقمیان بگەن بە ڕێککەوتنێك لە نێوان خۆیاندا، بەنیسبەت شێوەی ئەو حکومەتەی کە دەیانەوێت، لەگەڵ ئەو سنوورەی دەیانەوێت بیگرێتەوە، دوو نوێنەری پایە بەرز بنێرن بۆ بەغداد، بۆ ئەوەی گفتوگۆ بکەن لەسەر پەیوەندی سیاسی‌و ئابووری لە حکومەتی خاوەن شکۆو حکومەتی عێراقی"[5].

ئەوەی پاڵی نا بە هەردو حکومەتەوە کە ئەم بەیانە دەربکەن لەم خاڵانەی خوارەوەدا خۆی دەبینێتەوە:

1– ترسانی بەریتانییەکان لە بوونی پەیوەندی نهێنی شێخ مەحمود بە کەمالییەکانەوە.

2– لە هەمانکاتدا بوونی پڕوپاگەندەیەکی زۆری کەمالییەکان[6] لە سلێمانی بڵاوبووبوویەوە بەهۆی تورکخوانەکانەوە، لەبەر ئەوە بەریتانییەکان ویستیان بەهۆی ئەو بەیانەوە بتوانن کوردەکان بێدەنگ بکەن، لە هەمان کاتدا بیانکەن بە نەیاری کەمالییەکان[7].

### ئەو دەستە و کۆمەڵانەی کە لە دەوری شێخ کۆبوونەوە

شێخ مەحمود لە دوور وڵاتەوە بە ئومێدی دامەزراندنی حکومەتێکی کوردی‌و یەکگرتنی هەموو چین‌و توێژەکانی لە ژێر ئاڵای ئەو حکومەتەدا گەڕایەوە بۆ کوردستان[8]، هەوڵی زۆریدا بۆ ئەم مەبەستە، بەڵام بەدلخەوە ناکۆکی چین‌و توێژەکان زۆر لەوە قوڵتر بوو کە شێخ هەوڵی بۆ دەدا.

---

[1] بە وتەی ڕەفیق حیلمی، مێجەر (ئەدمۆنس) کە ڕاوێژکاری پێشووی وەزارەتی ناوخۆی بەریتانیا بوو لە نامەیەکدا کە بۆ ڕەفیق حیلمی ناردووە لەژێر ناوی (The middle East Lorand)داو لەژێر ناوی (The Kurds of Iraq) بڵاوکردووەتەوە، لەم بوارەدا ئەدمۆنس پێی وایە کە هەوای نەشئە بەخشی کوردستان شێخ مەحمودی سەرمەست کردو هەموو گفتێکی کە لە بەغداد دابووی لەبیر بردەوە، زۆری پێنەچوو نازناوی (مەلیکی کوردستانی) لەخۆی نا.

[2] هەرچەندە شێخ ڕەئوف لە یاداشتەکانیدا دەڵێ: نازناوی مەلیکی کوردستان لە کفرییەوە لە کۆنگرەی یەکەمدا بۆ شێخ هەڵبژێردرا، بەڵام زۆربەی سەرچاوەکانی تر ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ئەم نازناوە لە پاش دامەزراندنی حکومەتەکە بووە لە سلێمانی.

[3] کریس کۆچێرا: (هـ. س)، ل122–123.

[4] حامد محمود عیسی علی: المشكلة الكردية، ص135–136.

[5] ئەحمەد خواجە: چیم دی، ب3، ل113. قاسم خلف عاصي الجميلي: (هـ. س)، ص121.

[6] ئەم پڕوپاگەندانە بەهۆی پیاوەکانی تورکەوە بوون کە بڵاویان دەکردەوە، کوردستان بۆ ئەزدمیرەو بۆ تورك ساغ بووەتەوە، ئینگلیزەکان ترسیان دەخستە پێش ئەوانەی کە بە ئەوان ڕازی نین، (ڕەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جز6، ل567.

[7] قاسم خلف عاصي الجميلي: (هـ. س)، ص121.

[8] یادداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل90.

شێخ مەحمود هەر لە سەرەتادا، سەری سوڕمابوو، نەیدەزانی روویکاتە کام لا، لەبەر بێقەراری خەڵکو شێواوی تێکەڵو پێکەڵی بیروباوەڕ، سەری لێشێوابوو، باوەڕی بەکەس نەدەکرد، راوێژکارێکی دڵسۆزو نیشتمانپەروەری نەبوو، ئەوانە کە لەو رۆژەدا لە سلێمانی بوون دانوویان پێکەوە نەدەکولا،[1] هەریەکەیان سەر بە دەستەیەك بوو، کە پێکهاتبوون لەمانە:

**یەکەم: شێخەکانی بەرزنجەو نزیکەکانی**

ئەمانە لە لایەکەوە لەبەر ئەوەی شێخ مەحمود مەلیکەو لەبەرەی بەرزنجەیە، ئەیانویست هەر ئیشو کارێك هەیە، ئەبێ لە ژێر دەستی ئەواندا بێت، نەك هەر ئەوەندە بەڵکو بە هەموو جۆرێك ئەیانویست حکوم بکەنو خۆیان هەموو شتێك بن، هەریەکە لەلایەکەوە ئاغایەك بوو بۆ خۆی، کەس خەتی کەسی نەدەخوێندەوە.[2]

بێگومان ئەمەش کارێکی خراپی (سلبي) دەکردە سەر هەیبەتی شێخ مەحمودو مەلیکایەتییەکەی، بە جۆرێك کە خەڵکی بێزار بوویوون لە زۆری دەستەو دایەرەی حوکمدار، ئەمەش دەسەلاتەکەی شێخ مەحمودی بەرەو هەڵدێر دەبرد.

**دووەم: رۆشنبیرو نیشتمانپەروەرەکان**

هەندێك لە وڵات دیدەکانی سلێمانی لەو باوەڕەدابوون کە سیاسەتو خزمایەتی گەلێك لێك دوورنو لەسەر ئەو رێڕەوە بوون، کە مەیدانی سیاسەت ئەوەیە کە لە هەر لایەکەوە بای هات پیاو ئەبێت لەولایەوە شەن بکات، لە باوەڕی ئەواندا تێکچوونی دەوڵەتی عوسمانیو هاتنی ئینگلیز، ئەمە دەورێکە کە لە وڵاتدا کراوەتەوە، چونکە ئەگەر ئینگلیز نەبولیە کورد نەدەگەشت بەم سەربەخۆییە، لەبەر ئەوە کورد پێویستە لەگەڵ ئینگلیزدا بێت.[3]

لاوە نیشتمانپەروەرەکان لەگەڵ ئەوەشدا، کە زۆرکەم بوونو لە هیچ لایەکەوە پشتیوانیان نەبوو، بەڵام گیانی میللییان ئێجگار بەرزو بەهێز بوو، زۆربەی دەستەی خەڵکو رەشۆکی شار بەوانەوە ئەلکاو لێیان نزیك ئەکەوتنەوە.[4]

بەشێك لە مامۆستایانی قوتابخانەو ئەفسەرە لاوەکان[5]، بەتایبەتی دەستەی قوتابی، هۆی پەرەسەندنی بیری نیشتمانیو گیانی نەتەوەیی کورد بوون لە ناو خەڵکو دەستەی نەخوێندەواردا، نیشتمان پەروەرەکان لە لایەن تورك خواکانەوە بە فریودراوی ئینگلیز دادەنران.[6]

بەڵام شێخ مەحمود کە گەڕایەوە، ئەم ئەفسەرانە پەیوەندییان پێوەکرد بە مەبەستی خزمەتکردن لە حکومەتی کوردستاندا، نوێنەری چینی رۆشنبیریش بوون، بەدلخەوە شێخ نەیتوانی سوود لە شارەزاییان وەربگرێت، دووری خستنەوە، لە جیاتی پشتبەستن پێیان، لە بەڕێوەبردنی حکومەتەکەیدا[7]، کە بە خراپ بەسەریدا یەوە. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ پێکهاتنو سروشتی شێخ مەحمود، کە ئامادە نەبوو هیچ رۆشنبیرێك رەخنەی لێبگرێت.[8]

شێخ مەحمود ئەگەر بەم کارەش هەستابێت، مانای ئەوە ناگەیەنێت کە رێگەی بە رۆشنبیرەکان نەداوە بەشداری لە دەسەلاتو حکومەتدا بکەن، بەڵکو شێخ مەحمود وەك سەرکردەیەك، ئەوەی دەزانی کە زۆرێك لەم ئەفسەرانە لەلایەن

---

[1] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ 2، جز 6، ل540–541.

[2] سجادی: شۆڕشەکانی کورد، ل97.

[3] سجادی: شۆڕشەکانی کورد، ل57.

[4] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جز6، ل541.

[5] (ئەفسەرە لاوەکان) هەندێك لەو ئەفسەرانەن کە لە پێش گەڕانەوەی شێخ مەحمود لەلایەن حکومەتی عێراقەوەو مندوبی سامییەوە نێررابوون بۆ کوردستان، بۆ یاررمەتیدانی حکومەتەکەی شێخ کە هەستێکی نیشتمانیان هەبوو. (رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جز6، ل515.

[6] رەفیق حیلمی: یادداش، بگ2، جز6، ل541.

[7] حامد محمود عیسی: المسألة الكردية، ص137.

[8] حامد محمود عیسی: (هـ، س)، ص137.

حکومەتی عێراق و مەندوبی سامییەوە نێردراون، ئەبوایە حەزەری لێبکردنایە، بەتایبەت (سدیق پاشا)[1] ، کە پەیوەندی پتەوی لەگەڵ مەندوبی سامیدا هەبوو، چاوەڕێی ئەوەبوو کە حکومەتی کوردستان لە ژێر چاودێری ئەودا بێت.

**سێیەم: تورکپەرست یان پیاوەکانی تورک**

ئەمانە ئەو کەسانە بوون کە تورکەکانیان بە باشتر دادەنا، بەرژەوەندییان لەگەڵ تورکەکاندا دەگونجا، ئەمانە زیاتر پیاوانی ئایینی و ئەو کۆمەڵانە بوون کە لەسەر بیروڕای پێشین بوون. بوو بە ئامرازێك بۆ بڵاوکردنەوەی پروپاگەندەکانی ئۆزدەبیر[2] ، ئەمانە سووربوون لەسەر ئەوەی کە حکومەتی تورك، لەبەر ئەوەی ئیسلامییە، بێتەوەو لە ژێر فەرمانی خەلیفەدا بن[3] .

بۆ ئەوەی زیاتر لەم تورکخوانە ئاگادار بین، پێویستە چاوێك بە مێژوویاندا بخشێنین لە پاش دوورخستنەوەی شێخ، بەهۆی کردەوە ناڕەواکانی ئینگلیزەوە، شەڕو ناخۆشی هەموو ناوچەکانی کوردستانی گرتەوە بەتایبەت رانیەو قەڵادزەو کۆیە لەگەڵ ڕەواندز[4] ، ئەمانە هەموویان دژی ئینگلیز بوون، سلێمانی پاش داگیرکردنەوەی لەلایەن ئینگلیزەکانەوە پڕبوو لە هیندیو ئێرانی. کردەوە ناڕەواکانی مێجەرسۆن و لایەنگرانی ئینگلیز، ژیانیان لە خەڵکی تاڵ کردبوو[5] ، بۆیە خەڵك لەم کاتەدا بۆ رزگابوون لە حکومەتی ئینگلیزو جەورو ستەمی دەستو پێوەندەکانیان، دەستیان درێژدەکرد بۆ هەموو دوژمنێکی ئینگلیز[6].

ئاغاکانی قەڵادزەو رانیە لەگەڵ ڕەواندز، بەهۆی چەند کەسێك وەك ئەحمەد تەقی قسەیان کرد بە یەکو بڕیاریاندا کە نوێنەرێك بنێرن بۆ لای تورك، ئەوەبوو ڕەزامەندی لەلایەن والی (وان)[7] ، (قەدری بەگی خەڵکی دیاربەکر) وەرگیرا[8] ، ئەم هەواڵە بە شۆڕشگێڕەکانی ڕەواندز گەیەنرا، لە مانگی مایس لە بەهاری ساڵی 1921 مەفرەزەیەکیان ناردە شەمزینان، پاشانیش بۆ ڕەواندز، لە پاشان لە حوزەیرانی 1922 تورکەکان تاقمێك سەربازیان ناردە ڕەواندز لەژێر فەرماندەی (عەلی شەفیق) ناوێکدا کە خۆی ناونابوو (ئۆزدەمیر پاشا)[9] ، بەمەبەستی دروستکردنی پروپاگەندە بۆ هەڵگێڕانەوەی عەشیرەتە کوردەکانی باشووری کوردستان لە ئینگلیزەکان[10] ، گێڕانەوەی ئەو جێگایانەی کە لەلایەن ئینگلیزەکانەوە داگیرکراوەو بە خاکی تورك ناسراون[11] .

---

[1] (سدیق پاشا) لە شەڕی جیهانی یەکەمدا لە سوپای عوسمانیدا ئەفسەربوو، بە خۆی و تابوورەکەیەوە یان فەوجەکەیەوە گیراو رەوانەی رووسیا کرا، لەوێ لەگەڵ لەشکری سپیدا بەشداری شەڕی ناوخۆی کردو پلەی ژەنەراڵی وەرگرت، رووسیی باش دەزانی، پاش شکانی ئەم لەشکرە گەڕایەوە بەغدادو بەهۆی زمانەکەیەوەو شارەزاییەوە مەندوبی سامی لە خۆی نزیك کردەوە، پاشان لە کاتی حکومەتی شێخدا بە ئەمری مەندوبی سامی نێردرایە شلێمانی. (رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جز5، ل516–517.

[2] (أوزدمیر) بە مانای گیان پۆڵا دەگرێتەوە.

[3] سجادی: شۆڕشەکانی کورد، ل97.

[4] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جز6، ل 546.

[5] خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقیدا: ل 35.

[6] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، ب1، ل51.

[7] (وان) شارێکە دەکەوێتە کوردستانی تورکیاوە.

[8] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جز6، ل 546–547. خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقیدا: ل 45–46.

[9] منتشا شغیلی: (هـ.س)، ص318. عبدالرزاق الحسني: تأريخ العراق السياسي الحديث، ص286.

[10] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، ب1، ل24.

[11] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جز6، ل 554–556.

به گەیشتنی (ئۆزدەمیر) بۆ رەواندز، کوردەکان لە هەموو لایەکەوە کەوتنە هاتووچۆ، دەسەڵاتێکی گەورەی لە رەواندزدا پەیداکرد، گەلێك لە تیرەکانی کرد بە لایەنگری خۆیو تورکەکان، ناوچەکانی رەواندزو کۆیەو رانیەو بەشی زۆری پشدەر بە فەرمانی ئەم دەرۆشت بەڕێوە [1].

پاش کوژرانی (کابتن بۆند) [2]، لە لایەن کەرم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەندەوە پاڵیدا بەلای (ئۆزدەمیر)ەوەو پەیوەندی بە رەواندزەوە کرد، ئیتر هێزو دەسەڵاتی ئۆزدەمیر بەرەو زیادبوون دەرۆشت [3]، بەمشێوەیە زۆریەی ئەوانەی کە لەلایەن ئینگلیزەکانەوە گیروگرفتیان تووش بووبوو، رەواندزیان کردبوو بە بنکەی خۆیان [4]، ئەمانە هەندێکیان بە تەواوی بووبوون بە خزمەتکاری ئۆزدەمیرو بۆ مەبەستی تورکەکان کەوتنە چالاکی، ژمارەیەك لەم کۆمەڵەیە بە نهێنی لە شارەکانی کوردستانو سلێمانی بەتایبەتی، بە ئاشکرا وەك چەکدار لە رەواندز، بە هۆی پروپاگەندەکانی ئۆزدەمیرو هەڵوێستی دژیان بەرامبەر ئینگلیزەکان لە زیادبووندا بوو [5]، بە رادەیەك جێگای بە ئینگلیزەکان لەق کردبوو بەتایبەت پاش چۆڵکردنی رانیەو دەربەند [6]، بەهۆی فشاری سەربازانی ئۆزدەمیرو ئەم تاقمەوە [7].

ئینگلیزەکان بە هۆی فراوانخوازییەکانی ئۆزدەمیرەوەو ئەو کوردانەی کە بووبوون بە یەك لەگەڵیدا، سلێمانییان چۆڵ کردو شێخ مەحمودیان هێنایەوە، بۆیە کاتێك کە شێخ مەحمود گەڕایەوە، کار لە کار ترازابوو، تاقمی تورکخواکان بە رادەیەك پەرەیان سەندبوو، کە شێخ مەحمود نەیدەتوانی لە داویان دەربچێتو هەڵوێستێکی جیا وەربگرێت [8]، خێرا لەلایەن هەندێك ئاغای سەر بە تورکەوە بەخێرهاتنەوەی کرا، بە ئاگاداری (چکمەن) [9]، واتە شێخ مەحمود لە هەموو لایەکەوە بە تورك خواکان دەورە درابوو.

**چوارەم: ئینگلیز پەرستەکان یان پیاوەکانی ئینگلیز**

ئەمانە دەستەیەك لاو بوون، ئیمانیان بە ئینگلیز هێنابوو، ئەمانە سیخوڕو پیاوەکانی ئینگلیز بوون کە پاش دوورخستنەوەی شێخ مەحمود لە سلێمانی بووبوون بە کلکی ئینگلیزو یارمەتی مێجەرسۆنیان دەدا، خەریکی شەڕو ئاژاوە بوون، گاڵتەیان بە تەقەلای نیشتمان پەروەرەکان دەهات، بەلای ئەوانەوە تورکخواکان شوێن کڵاوی بابردوو کەوتوون [10].

بە تێپەڕبوونی کات، ژمارەی ئەم تاقمە زیادی کردو زۆریەی ناوچەکانی کوردستانی گرتەوە، بەتایبەتی پاش ئەوەی ئینگلیزەکان بۆیان روونبوویەوە کە بەکارهێنانی شێخ مەحمود بۆ جێبەجێکردنی مەرامی خۆیان شتێکی موستەحیلە، ئەمە وای لێکردن کە پەنا بەرنە بەر پیاوانی کوردی نۆکەری خۆیان،ماڵێکی زۆریشیان بەسەردا پژاندن، ژمارەیەکی زۆر لە ئاغاکانی رانیە بوونە پێشڕەوی ئەم کارە، سەنگاوو قەرەداغیش هەنگاوی خۆیانیان نا [11].

---

[1] منتشا شفيلي: (هـ.س)، ص318.

[2] دەسەڵاتداری سیاسی چەمچەماڵ بوو.

[3] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، ب1، ل262.

[4] أحمد عثمان أبوبكر: بيانات و تصريحات كولونيل مير الاندى أوزدمير ثاشا الى القبائل الكردية، جريدة خبات، ع834، 1997/7/25.

[5] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جزء6، ل 542–543.

[6] (دەربەند) ئەم دەربەندە لە رانیەیە، لە شەڕی دەربەندی رانیەدا ئینگلیزەکان تێکشکان بەرامبەر بە تورکەکان.

[7] أحمد عثمان أبوبكر: (ه.س).

[8] خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقیدا: ل 64–65.

[9] (چکمەن) ئەفسەرێکی سیاسیی بوو کە لەگەڵ مێجەر نۆئێڵدا لەگەڵ شێخ مەحمود هاتنەوە بۆ سلێمانی.

[10] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ1، ب2، ل29.

[11] یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل111.

شێخ مەحمودی تینوی ئازادی، ماندوو بەدەست فرەلایەنیو زۆری بیروڕاوە، نەیدەزانی لا بەلای کام لادا بکاتەوەو کێ بە راست بزانێت، هەر بۆیە لەسەرەتای هاتنەوەیدا پتر لە هەموو شتێك یەکێتیو برایەتی لە نێو گەلی کوردیا روونکردەوەو بۆ ئەو مەبەستە زۆر هانیدان، چونکە دەیزانی بەبێ یەکگرتن سەرکەوتن مەحاڵە[1] .

[1] یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل90.

### یەکەم: دەوڵەتی تورك ( ئۆزدەمیر )

پێش گەڕانەوەی شێخ بۆ سلێمانی، دەسەڵاتی ئۆزدەمیر بە شێوەیەك لە کوردستاندا پەرەی سەندبوو، بەتایبەت بە هۆی پڕوپاگەندەکانییەوە، ئینگلیزەکان بە پەلە شێخیان هێنایەوە بۆ سلێمانی [1]، بە ئاواتی دوورخستنەوەی ئەم مەترسییە لەسەر کوردستان.

بەڵام ئۆزدەمیر زۆر وردبینانەو بە ئەزموونەوە لە رووداوەکانی دەڕوانی، بۆیە پاش چۆڵکردنی سلێمانی لەلایەن ئینگلیزەکانو دامەزراندنی (مجلس میللی کوردستان) بە سەرۆکایەتی شێخ قادری حەفید، بە مەبەستی پاراستنی شار، دەستبەجێ نامەیەکی [2] دووردرێژی نارد بۆ شێخ قادر، لە بەندی حەوتەمی ئەم نامەیەدا وەسفو سەنای شێخ مەحمود دەکات، کە بەرامبەر ئینگلیزەکان جەنگاوەو دژایەتی کردوون، داوا لە شێخ قادریش دەکات لەسەر ئەو رێڕەوە بەردەوام بێتو نەکەوێتە تەڵەی ئینگلیزەکانەوە [3].

کاتێك شێخ گەڕایەوە سلێمانی، بە ناوی ئینگلیزەوە، تەنیا (مێجەر نۆئێلو چەکمن)ی لەگەڵدا بوو، کە رێگربن لەبەردەم شێخدا بۆ پەیوەندیکردن بە تورکەوە، ئەوانیش بە تورکخواکان دەورە درابوون [4]، تورکەکان زۆر لێزانانە بۆ ئەوەی پیشانی بدەن کە هەڵوێستیان بەرامبەر شێخ نەگۆڕاوە، ئەو هێزەی کە لە (قەمچوغە) [5] دا بوو گواستیانەوە بۆ رانیە [6].

مێژووی پەیوەندی نێوان شێخو تورکەکان، لە ئەیلولی (1922)ەوە دەستپێدەکات، واتە لەو رۆژەوەی پێینایە خاکی کوردستانەوەو پێش ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ سلێمانی [7]، شێخ کە گەڕایەوە پێشبینی ئەوەی کرد کە ئەو مەبەستەی ئینگلیزەکان بۆیان هێناوەتەوە [8] زۆر ستەمە بە تەنها ئەنجامی بدات، بارودۆخی سیاسیو ئابووری ئەوکاتەی دەوڵەتی ئینگلیزیش بە رادەیەك خراپ بوو، ئامادە نەبوون هیچ یارمەتییەك پێشکەش بە شێخ بکەن لەو بوارەدا [9]، بە هۆی ئەزموونی پێشووەوە کە لەگەڵ تورکدا هەیبوو [10]، وەهاش برابووە مێشکییەوە کە موسڵ ئەدرێتەوە بە تورك یان بە زۆر دەیگرنەوە، بارودۆخی ناوخۆی کوردستانیش زیاتر لە بەرژەوەندی تورکدا بوو [11].

شێخ لە رۆژێکی وادا ئەوە بارودۆخی کوردستانو هەڵوێستی دەوڵەتی پێشتگیر بێت، چۆن دەیتوانی لەگەڵ تورکدا بجەنگێ، ئایا ئەو هێزەیە لە رەواندز یان هێزی تری پاڵپشتی هەیە؟ ئایا سەرۆك عەشیرەتەکان تا سەر لەگەڵیدا دەبن یان نا؟ ئەگەر موسڵ درایەوە بە تورك شێخ چارەنووسی چی دەبێ؟ حکومەتەکەی چیی لێدێ؟ ئەمانە هەمووی خرابووە پێش چاوی شێخ وەك هۆیەك بۆ نزیکبوونەوە لە (ئۆزدەمیر)، ئەویش زۆر بە لێزانانە لە ژێرەوە بە نەرمی چ بەهۆی نامەکانییەوە

---

[1] خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقیدا: ل 67. أحمد عثمان أبوبکر: بیانات و تصریحات کولونیل میر الاندی أوزدمیر ثاشا الی القبائل الکردیة، جریدة خبات، ع834، 1997/7/25.

[2] دەربارەی ئەم نامەیە بگەڕێوە رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جز6، ل 594–595.

[3] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جز6، ل 595.

[4] بگەڕێوە بەشی دووەم، ئەو دەستەو کۆمەڵانەی کە لەدەوری شێخ کۆبوونەوە، تورك خواکان.

[5] (قەمچوغە) گوندێکە دەکەوێتە نێوان سلێمانیو دوکان.

[6] خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقیدا: ل 66.

[7] کەمال مەزهەر: نامەیەکی ونی شێخ مەحمود بۆ کەمالییەکان، گ: رەنگین، ژ: 107، 1997/14/14.

[8] بگەڕێوە بۆ بەشی یەکەم، هۆی گۆڕانی سیاسەتی بەریتانیاو عێراق بەرامبەر بە کوردستان.

[9] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جز6، ل 562–563.

[10] مەبەست ساڵی (1918)یە کە شێخ لەلایەن تورکەکانەوە گیرا، بە هۆی پەیوەندی بە ئینگلیزەوە، پاشان بە هۆی شەڕ وەستانی جەنگی جیهانییەوە بە یارمەتی عەلی ئیحسان پاشا ناردیانەوە بۆ سلێمانی.

[11] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جز6، ل 561–562.

یان بە هۆی پیاوەکانییەوە، بە وشەکانی (غەزا، دین، ئیسلامییەت) شێخی فریودابوو، لە بەرامبەرئەمانەدا وشەکانی کوردو کوردستان‌و نیشتمان بەرەو کزبوون دەڕۆشت‌و خەریکبوو لەبیربچێتەوە[1].

لە سلێمانی ئۆزدەمیر بەهۆی دەست‌و پێوەندەکانییەوە پەیوەندی بە شێخەوە کردو بە خێرهاتنەوەی لێکرا، لەو دیدارەدا نوێنەرەکەی تورك چاوی بە (چەکمەن) کەوتبوو، رێککەوتبوون لەسەر ئەوەی کە تورکەکان رانیە چۆڵ بکەن، کۆیەش لەلایەن ئینگلیزەکانەوەو شێخ ئیدارەی تیادابمەزرێنێت،[2] تورکەکان پاش گفتوگۆکردن لە نێوان خۆیاندا، لە کۆتاییدا ئۆزدەمیر رازی بوو بە مەرجێك یەکێکی سەر بە تورك بێت بە قایمقامی رانیە کە شێخ مەحمودیش متمانەی پێ بکات[3].

لە راستیدا ئەم هەڵوێستەی ئۆزدەمیر ئەگەر بۆ فریودانیش بێ سەری گرت‌و وای لە شێخ کرد، هەڵوێستی بگۆڕێت، بەتایبەتی پاش ئەوەی ئینگلیزەکان بەڵێنەکەیان کە پەیوەندی بە کۆیەوە هەبوو بۆ جێبەجێیان نەکرد.

ئەڵقەی پەیوەندی نێوان شێخ‌و ئۆزدەمیر بریتی بوو لە (تایەر ئەفەندی)[4]، کە بەهۆیەوە ئۆزدەمیر پەیوەندی بە شێخەوە دەکردو ئاگاداری هەموو کاروبارێك بوو لە سلێمانیدا، (فەوزی بەگی یوزباشی)[5]، پاش پەیوەندی کردنی بە شێخەوە، نامەیەکی دوورودرێژی بۆ ئۆزدەمیر نارد[6] و هەڵوێستی شێخ مەحمودی تیادا روونکردبوویەوە بەرامبەر بە تورك، کە بە تەواوی نەرم بوو، هەر لەو نامەیەدا شێخ چەند داواکارییەکی گرنگی لە تورك داواکردبوو، کە لە راستیدا وەك سیاسەتمەدارێکی خاوەن ئەزموون‌و دووربین لەگەڵ رووداوەکاندا جووڵابوویەوە[7].

جگە لەو نامەیە، شێخ راستەوخۆ نامەیەکی بۆ ئۆزدەمیر ناردبوو، لەو نامەیەدا ئەوەی دەرخستبوو کە کاتێك لە هیندستان بووە (کۆمەڵەی کوردستان) دامەزراوەو ئێستا سپێردراوە بە ئەوو پێشوازی لێکردووە، پاش ئەم نامەیە لەلایەن حکومەتی سلێمانییەوە چەند نامەیەکی تری بۆ نێردراوە[8]، شێخ لە پەیوەندی بەستن لەگەڵ ئۆزدەمیردا پەلەی کرد، بەتایبەتی پاش ئەوەی بە هۆی رووداوەکەی کۆیەوە لە ئینگلیزەکان زووێر بوو، دەستی بە پەیوەندی کردن کرد لەگەڵ ئۆزدەمیردا. سەبارەت بە دامەزراندنی ئیدارەیەك بۆ کوردستان. بەڵام ئۆزدەمیر وەڵامی دایەوە کە لە توانای ئەودا نییە[9]، پاش ئەمە شێخ بڕیاریدا وەفدێك بنێرێت بۆ ئەنقەرە، کە پێکهاتبوون لە (فەتاح بەگی ژنبرای، رەفیق حیلمی، ئەحمەد تەقی)[10].

---

[1] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جز6، ل 563.

[2] خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقیدا: ل 66.

[3] (هـ.س) سەرەوە: ل67–68.

[4] (تایەر ئەفەندی) لە راستیدا نوێنەری ئۆزدەمیر بوو لە بلاتەی مەلکی کوردستان، یەکێك بوو لە لایەنگرانی ئۆزدەمیرو لەوانە کە شێخیان بەلای تورکدا لادا، رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جز6، ل 541–542.

[5] یەکێك بوو لە نزیکەکانی ئۆزدەمیرو بە سفارشی ئەو هاتبووە کوردستان.

[6] دەربارەی ئەم نامەیە بڕوانە رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جز6، ل 599–600.

[7] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جز6، ل 602–603.

[8] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جز6، ل 604.

[9] خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقیدا: ل 68. کریس کۆچیرا: هەمان سەرچاوە، ل122.

[10] دەربارەی ئەم سەفەرەو ئەنجامەکەی بڕوانە رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ3، ل124–125. خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقیدا: ل 69–70.

ئەوەی لەم نامانەی شێخو هەڵوێستی بەرامبەر بە تورکو ئۆزدەمیر بەتایبەتی تێبینی دەکرێ، ئەوەیە کە شێخ بەهۆی یەکنەگرتنی دەستەو کۆمەڵەکانو خۆپەرستی پیاوە ناودارەکانی سلێمانی، خۆی بە تەنها مابوویەوەو ڕێنیشاندەرێکی وریاو نیشتمانپەروەرێکی دڵسۆزی نەبوو، نە ڕێکخستنێکی نەتەوەیی ڕێکوپێکو نە هێزێکی سیاسی بەهێزی هەبوو کە پاڵپشتی بێتو بۆ دۆزی کورد سوودی لێوەربگرێت،[1] شێخو ئەوانەی دەوروپشتی[2] لە سیاسەتدا کۆڵ بوونو تەواو نەبوون، لەبەر ئەوە کە لە کردەوەکانی ئینگلیز زوویر بوونو بڕوایان پێیان نەما، خێرا پەیوەندییان کرد بە ئۆزدەمیرو تورکەوە .[3] (سمکۆی شکاک)[4] ، لەم پەیوەندی کردنەدا دەوری کاریگەری هەبووە، چونکە داوای لە شێخ کردبوو، زوو داوای نێردراوەکانی ئۆزدەمیر بکات.[5]

شێخ حەزی لە دەسەڵات دەکرد، حەزی دەکرد ببێت بە مەلیکو خزمەتی کورد بکات، ڕێگای خۆیەختکردنی لە ڕێگای کوردستاندا خستبووە بەر، بەڵام هیوای نەمابوو، باوەڕیشی بە تورک نەدەکرد، دەیزانی نزیکبوونەوە لە تورک مانای رووخانی دەسەڵاتەکەیەتی، بەڵام بە هۆی زۆری پڕوپاگەندەکانی ئەوانەوە دەستەوەستان بوویوو .[6]

**دووەم: هێزە کوردییەکانی دراوسێ ( سمکۆ شکاک )**

شوێنی جوگراڤ کوردستانی باشوورو بارودۆخی سیاسی ئەوکاتە کە بەهۆی کۆتایی هاتنی جەنگی جیهانییەوە هاتبووە پێشەوە، دەوری هەبوو لەسەر شۆڕشەکانی شێخ مەحمود، کە زیاتر پەیوەندی سیاسیو سەربازی لەگەڵ کوردستانی ئێراندا هەبێت، زۆرجار ئەم پەیوەندییانە بە شێوەی یارمەتی سەربازی ئاڵوگۆڕکراوە، وەك هێرشو پەلامارەکانی شێخ بۆ سەر هێزەکانی رووس[7] . لە کوردستانی ئێران[8] ، سەرۆك تیرەو خێڵەکانی کوردی ئێرانیش، هەرچی لە دەستیان هاتبێت بۆ یارمەتیدانی شێخ مەحمود درێغییان نەکردووە، مەحمود خانی دزلی[9] ، لە رزگارکردنی شاری سلێمانی لە ساڵی 1919، لەلایەن شێخ مەحمودەوە دەورێکی کاریگەری هەبوو .[10]

---

[1] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جز6، ل 564.

[2] لێرەدا ئەحمەد تەقیو رەفیق حیلمیش دەگرێتەوە، چونکە هەردوکیان لە یاداشتەکانی خۆیاندا دانیان بە هەڵەی خۆیاندا ناوە.

[3] خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقیدا: ل 68.

[4] (سمکۆی شکاك) ئیسماعیل ئاغا بە سمکۆ ناودارە-کوڕی موحەممەد ئاغایە، یەکێکە لە سەرکردەکانی هۆزەکانی شکاکی کوردی، کە نیشتەجێی سنووری تورکی - ئێرانی لەناو ویلایەتی هەکاری لە تورکیاو ئورمیەو ئازربایجانی رۆژئاوا (ئێران)، مرۆڤێکی ئازاو چاونەترس بووە، لە شوباتی 1919 بەڕێوەبردنێکی حکومی لە ئازەربایجانی رۆژئاوادا دامەزراندو کاربەدەستی بۆ شارو گوندەکانی ژێر دەستی دانا، لەوانە ئورمیە. بەڵام لەم کاتەدا سمکۆ لەگەڵ ئینگلیزدا ناڕێك بوو. پاش هێرشکردنی تورکەکان بۆ بارەگاکەی، خێزانەکەی کوژرابوو، خەسرەوی کوڕی گیرابوو، 10 هەزار لیرەی ئاڵتونیشی لێزەوت کرابوو، بۆیە ئەیویست پێکەوە لەگەڵ شێخدا لەگەڵ تورکدا رێك بکەون. عثمان علي: اسماعيل ئاغا سمكۆ ثعلب السياسة الكردية و رائديها في البرغماتية، مجله ئاڵای ئیسلام - سنة7، ع1، 1993/1.

[5] خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقیدا: ل 70.

[6] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جز6، ل 564.

[7] ئەمە لەکاتێکدا بوو کە شێخ لە جەنگی (شوعەیبە) گەڕابوویەوەو ناوچەکانی مەریوانو بانە لەلایەن سوپای رووسییەوە گیرابوو، شێخ توانی دواشاری کوردستانی ئێران لە دەستیان رزگار بکات، یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل26–27.

[8] یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل27.

[9] بگەڕێوە بەشی یەکەم، جولانەوە سیاسییەکانی شێخ، ل13.

[10] خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقیدا: ل 28–29.

له حوزەیرانی ئەو ساڵەدا، کە شۆڕشەکە نسکۆی بەسەردا هات، ماڵو منداڵەکانی شێخ خۆیان گەیاندبووە سنووری کوردستانی ئێران، لەوێ خزمەتێکی بێ وێنە کران، بەتایبەتی لەلایەن سمکۆوە[1] باڵی باوکییەتی بەسەردا کێشانو حەواندنیەوە[2].

پاش گەڕانەوەی شێخ لە دوور وڵاتو دامەزراندنی حکومەتی کوردستان لە تشرینی یەکەمی 1922، پەیوەندییەکان زیاتر گەشەی کرد، سەروەرو گەورە پیاوانی کوردستانی ئێران، پۆل پۆل بۆ بەخێرهاتنەوەی شێخو پیرۆزبایی لێکردن حکومەتەکەی، دەهاتنە سلێمانیو بەڕێزەوە لەلایەن حکومداری کوردستانەوە پێشوازییان لێدەکرا، بەتایبەتی مەحمود خانی دزڵیو مەحمود خانی کانی سانانیو نوێنەری سەقزو بۆکانو کرمانشا[3].

هەر لەم کاتانەدا پەیوەندی شێخ مەحمودو سمکۆ[4] بەرەو باشبوون رۆیشتووە، هەردوکیان وەك دوو سەرکردەی خەمخۆری گەلی کورد بیریان لە یەکبوونی هێزەکان دەکردەوە،[5] پێش گەڕانەوەی شێخ بۆ سلێمانی سمکۆ پەیوەندی لەگەڵ کوردستاندا هەبووە[6]، شێخ کە گەڕایەوە کوردستان، ویستی بە زیادەوە چاکەی سمایل خان بداتەوە، بۆیە هەرچەندە ئەو سەردەمە پەیوەندی لەگەڵ بەریتانیاو عێراقدا بەرەو خراپی دەڕۆیشت، بە گەرمی پێشوازی لەو بروسکانە کرد کە لەلایەن سمکۆو سەید تەهاوە[7] بۆی نێردرابوون[8]. لە وەڵامی بروسکەیەکدا شێخ ئامادەیی خۆی بۆ پێشوازیکردن لە سمکۆ راگەیاند کە بێت بۆ سلێمانیو لە پایتەختی کوردستان ببێت بە میوان پاش ئەوەی کە چەند بروسکەیەکی تر لە نێوانیاندا ئاڵوگۆڕکرا، سمکۆ ئامادەیی خۆی نیشاندا کە بێت بۆ سلێمانی، شێخ لەمە ئاگادارکرا بوو، لیژنەیەکی پێشوازیکردن بە سەرۆکایەتی تایەر ئەفەندی سەرۆکی دیوانی مەلیکی نارد بۆ ئەوەی هاوڕێیەتی میوانی گەورە بکات، ئەوەبوو لە کانونی یەکەمی ساڵی (1922)دا سمکۆ لەلایەن جەماوەری سلێمانییەوە پێشوازیکرا[9].

ئەوەی لەم بروسکانەی سمکۆو شێخ تێبینی دەکرا، ئەوەبوو کە ئینگلیزەکان پاش ئەوەی بۆیان روونبووەوە شێخ ئومێدی ئەوەی لێناکرێ تورکەکانی رەواندز دەربکات. ئینگلیز راستەوخۆ پەیوەندی بەم دوو سەرکردەوە کرد، پاش

---

[1] (سمکۆ) لەمکاتانەدا ئەستێرەی بەختی لە ئاسۆی هیوادا پرشنگی ئەدایەوە لە باکوری خۆرئاوای ئێراندا ببوبوو بە شایی دووەم، نزیکەی هەموو ئازەربایجانی گرتبوو.

[2] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جز6، ل 576–577.

[3] یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل101.

[4] لێرەدا شۆڕشەکەی سمایل خانی سمکۆ دژبە حکومەتی ئێران، بە هۆی هەندێ لە پیاوانی تاوانباری عەشیرەتی شکاکەوە، دوچاری شکست هاتبوو بەم هۆیەوە سمکۆ ناچاربوو بڕوانە ناو خاکی کوردستانی تورکیاوە، بەڵام هێزەکانی تورك چواردەوریان گرتو وەك یارمەتیدانێك بۆ ئێران بە دیلیان گرتو دووریان خستەوە بۆ ناوچەیەکی دوور بەڵام پاشان لە تشرینی یەکەمی ساڵی 1922 لە کوردستانی عێراق لە هەولێرو رەواندز دەرکەوت.

[5] رەنجیار: سمایل خانی شکاك، گ: رابەر، ژ31–32، ساڵی چوارەم، 1995.

[6] ئەم پەیوەندییە بەهۆی مستەفا پاشای یامولکی بووە کە کۆمەڵەی کوردستانی دامەزراند، پەیوەندی بە سمایل خانەوە کرد، دەربارەی کوردستانی عێراق قسەو گفتوگۆیان کرد، ئەمە بووە هۆی زیادبوونی رقو کینەی تورکەکان بەرامبەر هەردوکیان، رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جز5، ل493.

[7] (سەید تەها شەمزینانی) لە شەمزینان لەدایك بووە، ناوچەیەکی کوردنشینەو کەوتووەتە رۆژهەڵاتی هەکاری لە تورکیا، لە ساڵی 1878ز، خوێندەوار بووەو کاتێك باوکی کۆچی کرد لە ساڵی 1903 سەرۆکایەتی ناوچەی گرتە ئەستۆ، لە کۆتایی سەردەمی عوسمانییەکاندا هاتووەتە موسڵو پاش هاتنی ئینگلیز بووە بە لایەنگریان، قاسم خلف عاصی الجمیلی: (هـ.س)، ص112.

[8] سجادی: شۆڕشەکانی کورد، ل99. یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل101.

[9] یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 105.

ئەوەی کە هاتنە هەولێر، نیازیان وابوو ئەوەی شێخ بۆی جێبەجێ نەکەن ئەگەر رای شێخ لە مەسەلەکە وەرنەگرن[1] بەمانەدا دەردەکەوێت کە ئینگلیز ئاگاداری هەموو شتێك بووە، ئەگەر تا چۆن ئەم بروسکانە بە ئاشکرا ئالوگۆڕ دەکرا.

پاش ئەوەی کە سمکۆ گەشتە سلێمانی، مستەفا پاشای دۆستی دێرینی سمکۆ، بە وتارێکی گەرمو بەهێز داستانی دوورو درێژی ئەم پاڵەوانەی خوێندەوە، لەسەر فەرمانی مەلیك خانووەکەی شێخ مستەفای نەقیب[2] پاککرایەوەو بۆی رێکخرا[3].

لەم هاتنەوەی سمکۆدا بۆ لای شێخ مەحمود زۆر رووداو خۆی دەردەخست، کە هەموویان بە قازانجی تورك دەشکایەوە، هێشتا سمکۆ ماندویی نەحەسابوویەوە، رەشەبای بەختی شووم دەستیکرد بە هەڵکردنو چرای هیوای نیشتمانپەروەرەکان دەستیکرد بە کوژاندنەوە، ئەوەبوو رەمزی بەگی تورك، لەگەڵ فەوزی بەگی یوزباشی، لە رەواندزەوە هاتنە سلێمانیو بە نهێنی لە ماڵی شێخ دابەزین[4].

هەر لەو کاتانەدا فەتاحی ئەمین عەتار[5] گەیشتە سلێمانی، سمکۆش ئینگلیزەکان خۆیان باوەڕیان پێکردبوو، لە هەولێرەوە ناردبوویان.

لە دەروونیدا باوەڕی بەو مەبەستە هەبوو کە بۆی هاتبوو[6]، لە دڵدا تورکی خۆش نەدەویست، دەیزانی کە دەستی لێوەشێنراوە، بۆی بکرایەو هیوای سەرکەوتنی ببوایە، بە هەموو جۆرێ هەوڵی دەدا تۆڵەیان لێبکاتەوە[7]، بەڵام رێڕەوی سیاسەتی بە جۆرێکی تر هاتە پێش چاو، پروپاگەندەکانی ئۆزدەمیرو لایەنگرانی ئێجگار وەستایانە بوو، پێشتر خەسرەوی کوڕی لەلایەن تورکەکانەوە بە دیل گیرابوو، 20 هەزار لیرەی ئاڵتونیشی لە خەزێنەی تورکدا هەبوو، لەو کاتەدا سمکۆ پارچەیەك زەوی شك نەدەبرد کە تێیدا بحەوێتەوە بەهۆی ئەو بارودۆخەی کە تێی کەوتبوو.

تورکەکانی دەستەی ئۆزدەمیر، بەتایبەت ئەفسەرەکان، بەهۆی تایەر ئەفەندییەوە ئەم هێزو هەڵوێستەیان خستەکار، بۆیە بە گەڕانەوەی خەسرەو و پارەکانیو بە بردنەوەی خۆی بۆ تورکیاو دانەوەی موڵکەکانی لەسەر سنوور، تەنانەت پێشکەشکردنی (مقاطعة)ێکی گەورەی وەکو (شەمزینان)، ئەویشیان تەفرەداو بۆ فریودانی شێخ مەحمودیش بەکاریان هێنا[8].

بەمشێوەیە پارسەنگی گفتوگۆکان بەلای تورکدا شکایەوە، بەتایبەتی لەو کاتەدا چی ئینگلیز بوو بە فەرمانی شێخ دوورخرابوویەوە، ئیتر سلێمانی وەك مەنجەڵی سەر ئاگر ئەکوڵاو ئاسمان هەور گرتبووی[9].

### دووەم: هەردوو دەوڵەتی بەریتانیاو عێراق

[1] یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 104. ئەحمەد خواجە: چیم دی، ل137.

[2] (شێخ مستەفای نەقیب) مامی شێخ مەحمود بوو.

[3] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جز6، ل 582.

[4] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جز6، ل 585.

[5] (فەتاح ئەمین عەتار) ژنبرای شێخ مەحمود بوو، ئەویش لەو رۆژەدا لە سوپای تورکدا پلەی یوزباشی هەبوو، بە پەلەپەل لە رێگای موسڵەوە گەڕایەوە عێراقو گەیشتە سلێمانی، رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جز6، ل 585–586.

[6] مەبەستی ئەوەیە کەوا لە شێخ مەحمود بکا، لەگەڵ ئینگلیزدا خۆی رێکبخاتو دژی تورك بووەستێتو ئۆزدەمیر لە رەواندز بکاتە دەرەوە.

[7] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جز6، ل 586.

[8] رەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، ل587.

[9] سجادی: شۆڕشەکانی کورد، ل99.

پاش دروستکردنی حکومەتی کوردستان لە تشرینی یەکەمی 1922[1]، شێخ کەوتە هەوڵدانی ئەوەی کە پەیوەندی حکومەتی کوردستان بە هەردوو دەوڵەتی بەریتانیاو عێراق لەسەر بنچینەی بەرژەوەندی هاویەش بێت، بەشێوەیەك کە هەردو دەوڵەت یارمەتی شێخ بدەن دان بە مافی گەلی کورددا بنێن، ئەویش پەیوەندی لەگەڵ تورکدا دەبڕێت[2].

ئینگلیزەکانیش لەلای خۆیانەوە بەڵێنی یارمەتییان پێدابوو لەگەڵ حکومەتی عێراقدا، بۆ یەککگرتنی کوردەکان[3] و مەلیك فەیسەڵ ڕێگایدا بە هەندێ لە ئەفسەرە کوردەکان کە لە سوپای عێراقیدا خزمەتیان دەکرد، بۆ یارمەتیدانی شێخ بگەڕێنەوە سلێمانی[4].

گومانی تێدا نییە شێخ لە پاش گفتوگۆ لەگەڵ مەندوبی سامیو مەلیك فەیسەڵدا لە بەغداد[5] پێش گەڕانەوەی بۆ سلێمانی، ئەوەی بەبیردا نەهاتبوو، جارێکی تر بیێەوەی هۆیەکی گەورە زۆری بۆ بهێنێ بەگژ ئینگلیزدا بچێتەوە، لەبەر ئەوە لەسەر ئینگلیزەکان پێویست بوو، کە سیاسەتێکی ڕوونو بێ توێکڵ بەرامبەر شێخ بگرنەبەر، بۆ ئەوەی ئەو پەڵە رەشانەی کە لە دەروونیدا لابەرێو بسرێتەوە، ئەبوو درۆی لەگەڵ نەکرێو تەنیا بیر لەوە نەکرێتەوە کە کوتەکێك بێت بەدەسیانەوە، چونکە شێخ هیچ نەبێت، خاوەن هەستێکی بەرزی میللی بوو[6].

ئینگلیز ئەمانەی فەرامۆشکردو سیاسەتێکی بەرامبەر بە بزووتنەوەی نەتەوایەتی کورد، لە بنچینەدا لێڵیو مناوەرەی بەخۆوە گرتبوو، تەنها مەبەستی کات بەسەربردن بوو، هەر لەو کاتەدا دەسەڵاتی بەسەر کوردستاندا گرتبوو، هیچ هەنگاوێکی لەسەرو شتی کرداریدا بەپێشەوە نەبربوو، بۆ بەهێزکردنی ئەوەی کە شێخ داوای دەکرد، بەڵکو بە پێچەوانەوەی خۆی بەرامبەر سروشتی گەلیو کەسایەتی شێخ بینایەوە، وەك سەرکردەیەکی نەتەوەییو نیشتمانی بۆ ڕشتنی ڕقو کینەی خۆی بەسەر ئەم کەسایەتییە نەتەوەییەدا، هەروەك مێجەرسۆن دەڵێت: "بە دووری نازانێت کە گەورەیی دەسەڵاتی شێخ وایلێبێت ببێت بە دەسەڵاتداری هەموو ناوچەکە"[7].

ئینگلیز هەوڵی دەدا کە شێخ بکات بە دارەدەستی خۆی، کە تەنیا ئامانجێکی هەبوو، ئەویش (سەربەخۆیی کوردستان)، لەبەر ئەمە، لەوانە نەبوو لە جێی سەربەخۆیی کوردستاندا خزمەتی ئینگلیز بکات بەرامبەر بەمە چاویان بڕی نەدەکرد، ئەیانویست بە بەرتیلو تەماعی دونیا بیکڕن، نەیانئەزانی چۆن بیکەن بە هاوپەیمانی خۆیان، بە زۆرو بە فێڵیش بۆیان نەدەبوو بە دارەدەست[8].

شێخ کە گەڕایەوە سلێمانی بارودۆخ بەشێوەیەکی تر بوو، بەرامبەر بە پڕوپاگەندەکانی تورك چارەیەکی نەمابوو[9]. ئینگلیزیش نەك هەر بەرنامەی یارمەتیدانی نەبوو کە چەکو پارە پێشکەش بە شێخ بکات دژی تورکەکان، بەڵکو دەیویست خۆی هەموو شتێك پێکەوە بنێ، چەك، پارە، لەشکرو هەموو هێزێکی تر کە پێویست بێ کۆی بکاتەوەو لە کوردستان

[1] رەفیق حیلمی: یاداشت، بگ2، جز5، ل526.
[2] یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 111.
[3] منتشا شفیلی: هەمان سەرچاوە، ص321–322.
[4] رەفیق حیلمی: یاداشت، بگ2، جز5، ل515. منتشا شفیلی: (هـ.س)، ص321–322.
[5] بۆ زیاتر شارەزایی بگەڕێوە رەفیق حیلمی: یاداشت، بگ2، جز5، ل529–530.
[6] رەفیق حیلمی: یاداشت، بگ2، جز5، ل529.
[7] فؤاد حمە خورشید: حلبجة في عام 1919، ج العراق عدد 1017، س2/7/1979.
[8] رەفیق حیلمی: یاداشت، بگ2، جز5، ل 529.
[9] رەفیق حیلمی: یاداشت، بگ2، جز6، ل 564.

تورکیان بۆ بکاتە دەرەوە[1]، بەڵام بزووتنەوەی نەتەوایەتی کوردی بەڕاستی لەوە ئاڵۆزترو زیاتر سەربەخۆتر بوو، لەوەی ببێت بە هێزێکی دەستی ئینگلیز[2]، لەپاش گەڕانەوەی شێخ مانگێك بەسەر نەچوو بێهیوا بوون، کاتێك شێخ لە تشرینی دووەمی 1922 مەلیکایەتی خۆیی ڕاگەیاند.

کردەوەو باسو خواستەکانی شێخ لەگەڵ ئۆزدەمیردا، کە بەهۆی کۆششی پیاوەکانی تورك بوو هەر زیادی دەکرد[3]، مێجەر نۆئێلْ مستەشاری سیاسی شێخ بوو، شکی بردبوو کە شتێك لە نێوان شێخو پیاوانی نزیکیدا هەیە، بۆیە گەلێ هەولێدا لەگەڵ شێخ بۆ ئەوەی لەو پەیوەندییانە پاشگەزی بکاتەوە، هەتاوەکو نەکەوێتە شوێن فڕوفێڵی میکاڤیلی ئۆزدەمیر[4]، چەندجارێ لە نێوان بەغدادو سلێمانیدا هاتوچۆی کرد، چەندجارێ بە فڕۆکە چووە لای ئینگلیزەکان، بە مەبەستی نزیکخستنەوەیان لەیەکتر، بەڵام نۆئێلْ لەو هەوڵەیدا سەرکەوتنی بەدەستنەهێنا[5]، نەخشەی ئەوەبوو کە شێخ مەحمودو سمکۆو سەید تەها، دژی تورکەکان بکاتە یەكو هانیان بدات لە دژیان[6]، وا دیاربوو سمکۆ نەیدەویست لە مەسئەلەی عێراقدا دەستی تێدابێ[7]، بەڵام سەید تەها هەنگاوی بۆ نا[8].

مێجەر نۆئێل کە زانی لەگەڵ شێخدا گفتوگۆ کەڵکی نییە، بۆ ئەوەی خۆی پیاوخراپ نەکات، چەکمەنی کرد بە وەکیلی خۆیو سلێمانی بەجێهێشت، بەرامبەر بەم هەڵوێستانە چەکمەن کەوتە خۆیو دەستەو دایەرەیەکی بۆ خۆی پەیداکرد، بەرەبەرە لە ژێرەوە بۆ ڕووخانی حکومەتی شێخ لە هەوڵداندابوو[9].

شێخ مەحمود بەرامبەر ئەم کارانەی چەکمەن هەتا دەهات توندتر دەبوو، کەوتە بیری ئەوەی کە پەلاماری کەرکوك بدات.

لەم ڕووەوە سەرۆك عەشیرەکانی بانگکردو کەوتنە گفتوگۆ، وەك وترا لەبەر ئەوەی گەلێ شەپۆلی فیکری لە سلێمانیدا هەبوو، هەندێ لەمانە لەگەڵی نەبوون، هەندێکیش قسەی ڕاستیان نەدەدا بەدەستەوە[10].

لەمدەورانەدا سمایل خانی سمکۆش هاتبوو بۆ سلێمانیو ببووە میوانی حکومەتی کوردستان، ئینگلیزەکان لەم هاتنەی سمکۆ کەوتنە هیوایەکەوە، بەنیازی ئەوەی وا لە شێخ بکات دژی تورکەکان بووەستێت، بەڵام پاش ئەوەی کە نەخشەکە سەری نەگرت، بەهۆی ئەوەی کە پڕوپاگەندەکانی تورك ئەویشی گرتەوە[11]، ئیتر ئینگلیزەکان زۆر داخ لەدڵ بوون، بەتایبەت بەرامبەر بە شێخ[12].

---

[1] ڕەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جز6، ل 566.

[2] منتشا شفیلی: (هـ.س)، ص320–321.

[3] بگەڕێرەوە بەشی سێیەم، پەیوەندییە دەرەکییەکانی شێخ، پەیوەندی بە ئۆزدەمیرەوە.

[4] سجادی: شۆڕشەکانی کورد، ل98.

[5] ڕەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جز6، ل 560.

[6] کریس کۆچێرا: کورد لە سەدەی نۆزدەو بیست، ل122.

[7] بگەڕێرەوە بۆ بەشی سێیەم، پەیوەندییە دەرەکییەکانی شێخ، پەیوەندی بە هێزە کوردییەکانی سمکۆ.

[8] بۆ زیاتر شارەزابوون بگەڕێوە بۆ کریس کۆچێرا، کوردستان لە سەدەی نۆزدەو بیستدا، ل122.

[9] سجادی: شۆڕشەکانی کورد، ل98.

[10] سجادی: شۆڕشەکانی کورد، ل99.

[11] ڕەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جز6، ل 574–575.

[12] سجادی: شۆڕشەکانی کورد، ل99.

رۆشنبیرانی کورد، بڕیاریاندا بکەونە وتوێژەوە لەگەڵ ئینگلیزدا بۆ ئەوەی ئەو ترسەی لەدڵیاندا بوو، بەرامبەر حکومەتی کوردستانو پەیوەندی شێخ بە تورکەکانەوە بڕەوێتەوە، دڵی ئینگلیزەکان بێتەوە جێ، بۆ ئەم مەبەستە سەید ئەحمەد بەرزنجییان ناردە بەغداد کە چاوی بە مەندوبی سامی بکەوێتو نامەیەکی نووسراوی شێخ مەحمودیشی بداتێ، بەڵام ئینگلیزەکان لە پێناو بەرژەوەندی خۆیاندا، لەگەڵ مەلیك فەیسەڵ ڕێککەوتن، کەوتنە سیاسەتی جیاوازخوازی لە کوردستانداو ڕێزیان بۆ نوێنەری کورد دانەنا [1].

### چوارەم: نامەو پەیوەندییە دبلۆماسییەکانی شێخ لەگەڵ وڵاتانی دەرەوە

پاش ئەوەی هەموو هەوڵێکی سیاسی درا، بۆ نەهێشتنی ناکۆکی لە نێوان حکومەتی ئینگلیزو عێراق لە کوردستانی خواروو، بەبێ ئەنجام مایەوە. شێخ لە دەرگای گەلێ لە دەوڵەتە گەورەکانی دنیایدا، بۆ ئەوەی پشتو پەنایەکی بەهێز بۆ گەلی کورد بدۆزێتەوە [2].

شێخ سەرۆکی حکومەتی کوردستانی خواروو، لە دەوڵەتی سۆڤیەت داوای یارمەتی کردو لە (30/کانونی دووەم/1923)دا نامەیەکی بۆ کۆنسوڵی سۆڤیەت لە تەبریز نارد [3]، لەو نامەیەدا هاتووە: "کاتێك دونیا دەنگی ئازادی ڕاستەقینەی گوێ لێبوو زانی کە گەلەکەتان لە چنگ چەوسێنەری تاوانبارەکان ڕزگاری بووە، هەموو گەلانی دونیاو نەتەوەکان شادومان بوون" [4].

هەر لە نامەکەدا هاتبوو، کە گەلی کورد پێی وایە گەلی رووسی یارمەتیدەرییەتی، ئەم گەلە لە تێڕوانینی کورددا، ئازادکەری ڕۆژهەڵاتو کوردە، [5] لە کۆتایی نامەکەدا دەڵێت: "ئێستا ئەوەی بۆ ئێمە گرنگە یارمەتی بە بارودۆخەکەمانە، گەلی ئێمە بە پەلە چاوەڕوانە، لە نێوان هەردوولادا پەیوەندی دابمەزرێتەوە" [6].

شێخ لەم نامەیەدا، زۆر دوربینو سیاسییانە بۆ ڕووداوەکان ڕۆیشت، کە تیایدا هەوڵی ئەوەی دابوو، هەرچۆنێك بێت پشتگیری سۆڤیەت بەدەست بێنێت، بەڵام چەند فاکتەرێك بوون بە ڕێگر لەبەردەم ئەم ئاواتەدا، بەتایبەت ئەو حکومەتەی کە شێخ دروستیکردبوو جێگیر نەبوو، زۆری نەخایاند، هەردوو دەوڵەت لەناویان برد [7].

دەوڵەتی سۆڤیەتی تازەدامەزراو، لەم کاتەدا زۆر پێویستی بە دانپیانان هەبوو لەلایەن وڵاتانەوە، لەبەر ئەوە زۆر سوور نەبوو لەسەر تێکڕای پەیمانی. بێلایەنیو دەستدرێژکردنە سەر دەوڵەتی تورك، بەهۆی یارمەتیدانی نەتەوەیەکی زۆرلێکراوەوە [8]، بەمشێوەیە جارێکی تریش کورد بوو بە قوربانی بەرژەوەندییە نێودەوڵەتییەکان، نامەکەش چووە فایلی مێژووەوە، ئێستا نوسخە ئەسڵییەکەی لە باکۆیە [9].

شێخ وەك سەرکردەیەکی خاوەن ئەزموونو سیاسی، کاری دبلۆماسییەتی بەرنەدا، ویستی لەو ڕۆشناییەوە مافێك بۆ کورد دیاری بکرێتو سنوورێك بۆ دەستدرێژییەکانی ئینگلیزو عێراق دابنرێت، بۆیە لەم پێناوەدا بانگەوازێکی تایبەتی بۆ هەمووبالیۆزخانەو سۆنگە بیانییەکان بڵاوکردەوە، تیایدا هاتبوو "ئێمەی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستانی باشوور، لە ساڵانی

---

[1] یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 110–111.

[2] یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 112. عزیز الحاج: القضية الكردية في العشرينات، ص107.

[3] لێرەدا شێخ لەتیف ئاماژە بۆ ئەوە دەکا، کە ئەم نامەیە بۆ لینین نێردراوە.

[4] قاسملو: کوردستانو کورد، چاپخانەی بنکەی پێشەوا، (و. عەبدوڵڵا حەسەنزادە)، (ب.ش).

[5] حامد محمود عيسى على: (هـ.س)، ص81.

[6] قاسملو: کوردستانو کورد، ل77.

[7] حامد محمود عيسى على: (ە.س)، ص81.

[8] کونتر دشنر: أحفاد صلاح الدين الأيوبي، (ت. عەبدوسسەلام مستەفا سديق)، دهۆك، 1997، ص104–105.

[9] یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 113.

جەنگی جیهانییەوە لە ئینگلیز داواکارین، مافە نەتەوایەتییەکانمان بسەلمێنیٚو داخوازییەکانمان بەجێبێنیٚ، بەلاٚم سوپای ئینگلیزو عێراق، دەستی بە کاولکردنی ولاٚتو کوشتنی هاولاٚتیان کرد"[1]، زیاتر لەسەری دەڕواو باسی مێژووی دەستدرێژییەکانی ئینگلیز بەرامبەر بە کورد دەکات، لە کۆتایی نامەکەدا دەڵێت: "سەرباری ئەوەی کە موڵکی خەڵکی بە تالاٚن براوەو سەرانسەری ولاٚت وێران کراوە، ئێمە لە دادپەروەریو هەڵوێستتان بەرامبەر بە مرۆڤو دادپەروەری مرۆڤایەتیتان دڵنیاینو لە دادپەروەری جیهانی داواکارین، دژی ئەم جۆرە ستەمو دەستدرێژیو زۆرلێکردنە دەنگی ناڕەوای خۆی بەرزکاتەوە"[2].

ئەم داواکارییانە لە راستیدا هەڵقولاٚوی سروشتی ئەو رۆژەی گەلی کورد بووە لە کوردستانی عێراق، لەپێناو بەدەستهێنانی سەربەستیو سەربەخۆییو دورکەوتنەوە لە کۆیلایەتیو کوشتنو بڕین، بەلاٚم سروشتی سیاسەت بەرژەوەندی دەکات بە پێوەر، هەر لایەکی تەرازووەکە پارسەنگ بوو، بەو دیوەدا روودەکات.

سکالاٚی میللەتی کوردیش لەو سەردەمەدا ئەو قورساییەی نەبوو کە هەڵوێستی دەوڵەتە گەورەکان بەلای خۆیدا راکێشیٚو لەو نێوەندەدا مافی خۆی بەدەست بهێنیٚ.

---

[1] عزیز شەمزینی: (هـ.س)، ل114–115.

[2] عزیز شمزیی: (هـ.س)، ل114–115.

## تێکچوونی پەیوەندی شێخ و هەردوو حکومەت

ئینگلیز وەك پێشبینی دەکرد، باروذۆخ بەو شێوەیە نەدەڕۆیشت بەڕێوە کە نەخشەی بۆ دانابوو، سەبارەت بە هەڵسوکەتی شێخ، چونکە سیاسەی ملکەچی بۆ ئینگلیز ڕەتکردەوە، دەیویست هەموو کوردستان ڕزگار بکات، لەبەر ئەوە پابەند نەبوو بە دەسەڵاتی لە سلێمانی، ئەو ناوچانەی بۆی دیاری کراوە [1]، بەبێ ڕەزامەندی ئینگلیز مەلیکایەتی خۆی ڕاگەیاند [2].

شێخ کاتێك بۆی ڕوونبووەوە، ئینگلیز هەموو شتێکی بەرژەوەندییەو بۆ سوودی شێخ هیچ هەنگاوێك نانێت، [3] لەجیاتی دوژمنایەتیکردنی تورکیا، وەك ئینگلیزەکان ئاواتیان بوو، هەوڵیدا پەیوەندی لەگەڵ تورکیادا ببەستێ [4]، جگە لەو پەیوەندیو نامە گۆڕینەوانەی کە لەگەڵ ئۆزدەمیردا هەیبوو، بڕیاریدا وەفدێك بنێرێتە ئەنقەرە بۆ ئەم مەبەستەو لەسەر ئیدارەیەکی هاوبەشی کوردو تورك بە سەرۆکایەتی شێخ پێکبێن [5].

ئینگلیز بەهۆی پیاوەکانییەوە ئاگاداری ئەم پەیوەندییانە بوو، ئومێدی بە شێخ نەمابوو، تێڕوانینیان سەبارەت بە شێخ هەر لە کفری گۆڕابوو [6]، بۆیە پاش ڕاگەیاندنی مەلیکایەتی، ناڕەزاییان بەرزکردەوە، ماوەی ئەوەیان نەدا دەنگی کورد، بە هیچ حکومەتێك، یان گەلێکی خاوەن بەختدا بگات [7]، لە بەغدادەوە بۆ بەرژەوەندی خۆیان هەندێ جار، ناوی کوردو کوردستانیان ئەژیانەوە، ئەویش بۆ ئەوەی پەیمانە ویستراوەکەی خۆیان [8]، بە حکومەتی عێراقی کۆتایی پێبێنن، بە کورد بە تۆقاندن، ئینگلیز کاتێك لگەڵ حکومەتی عێراق پێکهات، شەرو مەرجیان تەواوبوو، بۆ خاوکردنەوەی ریسەکەی کوردو شێخ، ئەکەوتە هاندانی رۆژنامەی بەغداد، بە نمونە لە رۆژنامەی (البراق) چاپی بەغداد ژمارە (738–743 تشرینی دووەم/1922) لەبابەت دروستکردنی حکومەتو وەزارەتەکەی شێخ بە گرنگی ئەیاننووسی، لە سلێمانی کۆمەڵێ ئیدارە پێکهێنرا کە سلێمانی لیوایەکی عێراقە، دیارە ئەم ئاژاوە لەلایەن ئینگلیزەوە بوو [9].

هێشتا پەیمانی لۆزان، [10] مۆرنەکرابوو، واتە لە ساڵی (1922–1923) کوردەکانی عێراق، ئەوەیان بۆ دەرکەوتبوو، حکومەتی گەورەی وا کوردستانی عێراقی بەرکەوێ، لەبەر ئەوە کە بەرهەڵستییان زۆرە، دانامەزرێو نایەڵن، بەڵکو ئەو جۆرە دەنگۆیە لە ناودا هەیە کە کوردستانی عێراق بخرێتە سەر عێرق [11].

---

[1] حامد محمود عیسی علي: (م.س)، ص138.

[2] عبدالرزاق الحسني: تأريخ الوزارات العراقية، ج1–2، ص263.

[3] ڕەفیق حیلمی: یاددداشت، بگ2، جز6، ل 566.

[4] حامد محمود عیسی علي: (م.س)، ص138.

[5] بۆ زیاتر شارەزایی بگەڕێوە خەباتی گەلی کورد لە یاداشتەکانی ئەحمەد تەقیدا: ل74.

[6] ڕەفیق حیلمی: یادداشت، بگ2، جز5، ل531.

[7] ئەحمەد خواجە: چیم دی، ب3، ل127.

[8] ئەم پەیمانە لە (10/تشرینی یەکەم/1922) بوو، کە لە پشاندا ماوەی ئەم پەیمانە لە پرۆتۆکۆلی (30/نیسان/1923) بۆ ماوەی چوار ساڵ درێژکرایەوە، کە لەپاش پەیمانی ئاشتی لەگەڵ تورکیادا دەستپێدەکات، تیایدا سلێمانی خرایە سەر حکومەتی عێراق، عبدالرزاق الحسني: تأريخ الوزارات العراقية، ج1–2، ص263.

[9] ئەحمەد خواجە: چیم دی، ب3، ل127.

[10] (پەیمانی لۆزان) ئەو پەیمانە بوو کە لە (24/تەمموز/1923) لەنێوان هاوپەیمانەکانو تورکیادا بەسترا، بەهۆی بە هێزبوونی هەڵوێستی سیاسی تورکیا بەرامبەریان، ئەم پەیمانە مافی کوردی پێشێل کرد.

[11] سجادی: شۆڕشەکانی کورد، ل101.

لە نێوەندی گفتوگۆی پێشوەخت بۆ بەستنی پەیمانی لۆزان، دەركەوت بۆ ئینگلیز، هیوا بۆ دروستكردنی حكومەتێكی كوردی، كە ناوچە كوردنشینەكانی باكوری عێراق بگرێتەوە، زۆر لاوازە، چونكە گومانی تێدا نییە، بۆ دروستكردنی حكومەتی عێراقی، ئەبێت ناوچەكانی كوردستانی عێراقی برواتە سەر[1]، بۆیە پێكەوەو بۆ سنووردانانی لەبەردەم شێخو دڵنیاكردنی رەگەزە كوردییەكان كە بەرژەوەندییان پشتگوێ ناخرێ، بۆ ئەم مەبەستە لە (22/كانونی یەكەم/1922) بەیانێكیان دەركرد[2]، پەیوەندی نێوان شێخو هەردوو دەوڵەت زیاتر بەرەو گرژبوون دەرۆیشت، بەتایبەتی پاش رۆشتنی (مێجەر نۆئێل)و دەستبەكاربوونی (چەكمەن) وەك راوێژكاری سیاسی، بە هەموو شێوەیەك لە پێناو سنووردانان بۆ دەسەلاتی شێخ لە هەوڵداندا بوو[3]، ئینگلیزەكان پەنایان بردە بەر پیاوانی لایەنگری خۆیانو ماڵێكی زۆری بەسەردا بەخشینەوە، بۆ ئەوەی ببنە نەیاری شێخ، بۆیە هەندێك لە پشدەرییەكان چوونە پاڵیانو بوون بە پێشرەوی ئەم كارە، لە سەنگاویش ژمارەیەك بوو بە موچەخۆری دەوڵەت، هەندێك لە ساداتی كربچنەو كانیكەوە لە ئینگلیز نزیك بوونەوە[4].

شێخ كەوتبووە نێوان دوو ئاگرەوە، ئاگری داگیركردنی ئینگلیزو ئاگری پیاوانی ناوخۆ، كە هەردەم كۆسپ بوون لەبەردەم ئاواتی دێرینەی كورددا، ئەوەی زیاتر ئینگلیزی لە شێخ زویر كرد، هەوڵدانی بوو بۆ پەیوەندیكردن بە رووسیای سۆڤیەتەوە، داوایكرد پەیوەندی توندوتۆڵ لە نێوانیاندا بێتەكایەوە.

لە نامەكەیدا كە بەهۆی قونسوڵی رووسیا لە تەبریز[5]ەوە بۆ سەركردایەتی سۆڤیەتی ناردبوو هاتبوو كە "یەكێتی سۆڤیەت هاورێی گەلە تێكۆشەرەكان، لەپێناو ئازادیو رزگاركەری رۆژهەلاتە"[6]، ئینگلیز زیاتر لە هەڵوێستی شێخ كەوتە دوودڵییەوە.

هەڵوێستی سەربەخۆییو نیشتمانی شێخ، سەركردە ئینگلیزەكانی ماندوو كردبوو، بۆیە لێرەوە بۆ هەل دەگەڕان خۆیانی لێ رزگار بكەن، بەتایبەتی بارودۆخی ناوچەیی لە عێراقو وڵاتاندا، بەرەو باشبوون دەرۆیشت، هەڵوێستی لەگەڵ توركیاش بەرەو نزیكبوونەوە بوو، بەتایبەتی پاش رازیبوونی تورك كە كێشەی موسڵ بدرێتە كۆمەڵەی گەلان[7].

ئینگلیز گەیشتە ئەو بڕوایەی كە لە توانایدا هەیە بەرژەوەندییەكانی خۆی لە عێراقو كوردستاندا بپارێزێت، بەتایبەت دەسەلاتدارانی عێراق لە پێشەنگیان مەلیك فەیسەڵ لە گرنگترین ئەو كەسانە بوون كە داوای جێبەجێكردنی بەرژەوەندی ئینگلیزی دەكرد، بەمشێوەیە ئەو فاكتەرانەی كە شێخی بۆ گەڕاندەوە كاریگەری نەما، لە بەرژەوەندی ئینگلیز نەبوو دەوڵەتانی ئێرانو عێراقی توركیا بەرامبەر بە خۆی تووڕە بكات كە تەنیا كۆسپێكن لەبەردەم بڵاوبوونەوەی بیری كۆمۆنیستی لە رۆژهەلاتدا، بەرامبەر بە یارمەتیدانی حكومەتێكی كوردی لە سلێمانی كە گومانی لێدەكرێت لە لایەنگری بۆ ئینگلیز.

ئەوەبوو ئینگلیز هەڵوێستی كۆتایی وەرگرت، بە لكاندنی كوردستانی باشوور بە عێراقەوەو پێویستی لەناوبردنی حكومەتی سلێمانی بە سەركردایەتی شێخ مەحمود.

## دووەم: رووخانی حكومەتی شێخو داگیركردنی سلێمانی لەلایەن ئینگلیزو عێراقەوە

---

[1] عبدالرزاق الحسني: تأريخ العراق الحديث، ج3، ص287-288.

[2] دەربارەی ئەم بەیانە بگەڕێوە بەشی دووەم، دامەزراندنی حكومەتو راگەیاندنی مەلیكایەتی، ل32-33.

[3] سجادی: شۆڕشەكانی كورد، ل98.

[4] یاداشتەكانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 111.

[5] (تەبرێز) شارێكی گەورەی ئێرانە، دەكەوێتە باكوری رۆژهەلاتی.

[6] حسين مدني: كردستان، بروسیو تحلیل نهفشهاي آزادبخش میللي در كردستان، ل31-32. حامد محمود عیسی علی: (هـ.س)،ص138.

[7] حامد محمود عیسی علي: (هـ.س)، ص 139.

ئینگلیز خێرا هەستی بەوەکرد، کە پشتگوێخستنی زۆری شێخو هەلگەڕانەوەکەی، ئەبێت بەهۆی هەلگەڕانەوەی گشتی دژیان، فراواندەبێت بۆ بازنەی ڕاپەڕینێکی گەلی [1]، بەتایبەتی پاش ئەو ناکۆکیو ململانێ سیاسییەی کە لە نێوان حکومەتی کوردستان، بە سەرۆکایەتی شێخ مەحمودو هەردو دەولەتی ئینگلیزو عێراق، سەری هەلداو بەرەو گرژبوون دەڕۆیشت [2]، بەهۆی نارێکی سیاسەتی ئینگلیز بەرامبەر بە دۆزی کورد، چونکە ئامانجی سەرەکی ئینگلیز لە کوردستانی عێراقدا، دروستکردنو بەهێزکردنی بنکە سەربازییە ستراتیژییەکانی خۆی بوو، بۆ خزمەتکردنی نەخشەو پیلانە داگیرکارییەکانی خۆی لە عێراقدا بەتایبەتیو ڕۆژهەلاتی نزیکو ناوەڕاست بە گشتی.

ئەگەر کەمێك نەرمییان بۆ دروستکردنی دەسەلاتێکی جیا بۆ کورد پیشان دابێت، وەك دەرکەوت لەپێشەوە، تەنها لە نێوەندی هەلوێستی تاکتیکی ئالوگۆڕی کاتیدا خۆی دەبینێتەوە بەسەر ئەوەی کە سیاسەتیان بەرامبەر دۆزی کورد لە عێراقدا گەشەی نەکرد، جێگیر نەبوو بەشێوەیەکی گشتی، تا ئەوکاتەی کە دەسەلاتێکی سەربەخۆیانو پابەند بە چەند پەیمانێکی ستراتیژیو ملکەچ بۆ مەندوبی سامیو ڕاوێژکارە ئینگلیزەکان لە عێراقدا دروستکرد [3]، پاش ئەوەی کە ئەم مەبەستەی ئەنجامدا، ئیتر خۆی بۆ دۆزی کورد یەکلا کردەوە.

لێرەوە ئینگلیزەکان بڕیاریان هاتە سەر ئەوەی کە بە بەکارهێنانی هێزو سەرکوتکردنی ئەو مەترسییە چاوەڕێکراوە، خۆیان ڕزگار بکەنو شێخ ناچار بکەن بێتە ژێر بەڕێوەبردنیانەوە [4].

بۆیە لە (24/شوبات/1923) دەسەلاتدارانی بەڕێوەبەر لە ڕادیۆی بەغداد بەیانێکیان بلاوکردەوە کە شێخیان تێدا تاوانبار کردبوو بە شکاندنی ئەو پەیمانەی کە لەگەلّ ئینگلیزدا پێکهاتبوون لەسەری، حکومەتی کوردی هەلوەشاندەوە، داوای لە شێخو شوێنکەوتووانی کرد کە بێن بۆ بەغداد، وازهێنانیان بە قازانجی ئەو کەسایەتیانەی کە پابەندی پاراستنی یاسان [5].

لەم کاتەدا کە پەیوەندی نێوان حکومەتی کوردیو دەسەلاتدارانی بەغداد زیاتر بەرەو گرژبوون دەڕۆیشت، سمایل خانی سمکۆ لە سلێمانی، میوانی حکومەتی کوردستان بوو، ئینگلیز کەوتە پیلانەوەو بۆ بەئەنجامگەیاندنی سیاسەتە دێرینەکەی خۆیان (پەرتکەو زالبە) ویستی شێخ لە سمکۆ بکەوێتە گومانەوە، بۆیە لە (23/شوبات/1923) بەیاننامەی ئاگاداری لەلایەن ئینگلیزەکان بەسەر شاری سلێمانیدا بلاوکردەوە، کە سمکۆی ئاگادار کردبوو، سلێمانی بەجێبهێلێت، چونکە بۆردومانی شار دەکرێتو نایانەوێت دلّی ئەو لە خۆیان برەنجێنێت [6]، سمایل ئاغا لە (28/شوبات/1923) دیدەنی تەواوبوو بە خۆیو چەکدارەکانییەوە چوونەوە بۆ ولاتی خۆیان، پاش ئەوەی ئینگلیز لە (26/شوبات/1923) ئاگاداری دا بە شێخ مەحمودو خەلّکی شار کە سلێمانی بەجێبهێلّن، چونکە بۆردومان دەکرێ [7]، شێخ لەلای خۆیەوە بۆ ڕوویەڕووبوونەوەی ئینگلیز خۆی ئامادەکرد، هێزی پێکەوەنا، دانیشتووان بەلێنیاندا بە سەرو مالّەوە لەگەلّیدابن، شێخ بۆ پارێزگاری لە شاری

[1] عومەر عەبدولعەزیز هەورامانی: (هـ.س)، ص96.
[2] عەزیز شەمزینی: (هـ.س)، ل
[3] عزيز الحاج: القضة الكردية في العشرينات، ص1–2. الأنتصار، بغداد، 1985، ص95.
[4] عومەر عەبدولعەزیز هەورامانی: (هـ.س)،ص96.
[5] منتشا شغيلى: (هـ.س)، ص123–124.
[6] سجادی: شۆڕشەکانی کورد، ل99.
[7] سجادی: شۆڕشەکانی کورد، ل100.

سلێمانی بەرامبەر بە بۆردومانی ئینگلیز شاری بەجێهێشت[1]، بە خۆیو لەشکریەوە چوونەدەرەوەو روویانکردە ئەشکەوتی (جاسەنە)[2] لە 4/ئازار/1923، خەڵکی شاریش بەرەبەرە دەرچوونو روویانکردە قەرەداغو شارباژێڕ[3].

لەشکری شێخ پاش ئەوەی کە لە جاسەنە مۆڵیان دابوو، بەرەو چەمچەماڵ رۆیشتنو ویستی کەرکوك بگرێت، بەڵام بەهۆی هەندێ کۆسپو تەگەرەوە نەیتوانی ئەو کارە بکات، ئەو کۆسپانەش:

1– سەرهەڵدانی ناپاکی لە ریزەکانی سوپادا.

2– هەندێك لە شێخەکانی گەرمیانو بەشێك لە پشدەرییەکان بووبوونە پیاوی حاکمی سیاسی ئینگلیز لە کەرکوك.

3– وازهێنانی شێخ قادری حەفید، برای شێخ لە شۆڕشو دانیشتنی لە گوندێك لە ناوچەی قەرەداغ[4].

ئەم هۆیانەو هەندێکی تر بوون بەهۆی تێکچوونی ئەو هێرشە گەورەیەی کە شێخ بەدەستییەوە بوو بۆ کەرکوك.

شێخ لەگەڵ لەشکرەکەیدا پاش ئەوەی لە سورداش جێگیربوون، ئەشکەوتی جاسەنەیان کرد بە بنکەی خۆیان، لەوێدا چەکدارەکان رۆژنامەی (بانگی حەق)یان دەرکرد، داوای لە کوردەکانی دەورویەر دەکرد دژی ئینگلیزەکان خەبات بکەن[5].

پێش ئەوەی دانیشتووان بەتەواوی شار چۆڵ بکەن، لە بەیانی (4/ئازار/1923) فڕۆکە بۆمهاوێژەکانی ئینگلیز هاتنە سەر ئاسمانی سلێمانیو دەستیانکرد بە سوڕانەوەو بۆردومانکردن بەشێوەیەکی چڕ[6]، بۆردومانەکە زۆربەی گەڕەکەکانی گرتەوە، لەگەڵ رێگاو بانەکانو دامودەزگاکانی حکومەتدا، زەرەرو زیانێکی گەورە سلێمانی گرتەوە، دەیان هاوڵاتی بێتاوان کوژرانو بریندار بوون[7].

ئەم بەسەرهاتە کە چاوەڕێ نەدەکرا لەلایەن ئینگلیزەوە، کە خۆی بە پارێزەری ماف مرۆڤو هەڵگری دروشمی رەنگاورەنگ دادەنا لەگەڵ پاراستنو رێزگرتنی ماف گەلانو دانپیانەری حکومەتی سلێمانی.

بەوهۆیەوە شێخ بەیانێکی ناڕەزایی دژی ئەو هەڵوێستەی ئینگلیز دەرکرد، تیایدا هاتبوو: "ئامانجمان پاراستنی ئیسلامو سەروەرییەتی، کامەرانیو بەختەوەری کوردو پاراستنی کیانی"، لە بەیانەکەدا هاتبوو کە "هەستانی فڕۆکەکانی ئینگلیز بە بۆردومانکردنی شار بەو شێوە نامرۆڤانەیە کە بوو بەهۆی شەهیدکردنو بریندارکردنی ژمارەیەکی زۆر لە ئافرەتو منداڵی بێتاوان، پەردەی لەسەر تاوانو خراپی مەبەستیان لادا"[8].

فڕۆکەکان نەگەشتبوونەوە فڕۆکەخانەکانی خۆیان، لەشکری عێراقی تازەدامەزراو، بە راوێژکاریو سەرۆکایەتی ئەفسەرانی ئینگلیز بەرەو پێشەوە رۆشتنو شاری سلێمانیان داگیرکردەوە[9].

"سلێمانی لەمکاتەدا لە دەنگی شینو گریانی ئەو کەسانەی فریانەکەوتبوون دەرچن دنیای هەژاندبوو"[10]، بەڵام لەشکری کوردستان لە هەموو ناوچەکانی لیوای سلێمانیو کەرکوك، پەلاماری داگیرکەرانیان دەدا، شەڕی پارتیزانییان دەستپێکردبوو[11].

---

1 یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 116–117.

2 (جاسەنە) ئەشکەوتێکە دەکەوێتە سورداش لە ناوچەی گەرمیان.

3 سجادی: شۆڕشەکانی کورد، ل100. منتشا شغيلي: (ە.س)، ص325–326.

4 یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 117.

5 منتشا شغيلي: (ھ.س)، ص326.

6 سجادی: شۆڕشەکانی کورد، ل100.

7 یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 119. عومەر عەبدولعەزیز هەورامانی: القضية الكردية، ص96–97.

8 عومەر عەبدولعەزیز هەورامانی: (ھ.س)،ص97.

9 حامد محمود عيسى علي: (ھ.س)، ص145.

پاش گەڕانەوەی کاربەدەستانی ئینگلیز بۆ سلێمانی، هەوڵێکی زۆریاندا کە خەڵکی رازی بکەن کە بیانخەنە سەر حکومەتی عێراق، ژمارەیەك پیاوی خۆفرۆشیان لە عێراقدا کڕیو کریانن بە موچەخۆرو پلەی بەرزیان دانیٚ. بۆ ئەوەی سەرۆك تیرەکان لە شێخ دووربخەنەوە، لە شارو شارۆچکەکاندا بەڕێوەبەری سەربەخۆیان دانا، ساڵح پاشایان کرد بە موتەسەڕیفی سلێمانیو دەسەڵاتی خۆیان لە ناوچەکانی پشدەر پیٚ بڵاوکردەوە.

لە سلێمانی ئینگلیز دەستیکرد بە ئاژاوەنانەوە، هەوڵی شەڕی براکوژی دەدا لە نێوان کوردا. زۆر هەوڵیدا شێخەکانی بەرزنجەو شارباژێڕو سلێمانی پێش بکەنە شێخ مەحمود بەڵام سەری نەگرت[1].

شێخ لە ناوچەی قەمچوغەو ئەشکەتی جاسەنە بوو، فڕۆکەو باڵۆن هەموو ساتێك بەسەر سەریەوە بوون، شەڕ لە نێوان حکومەتی کوردستانو ئینگلیزدا بوویوو بە داشی دامەو هەر جارەی بەلایەکدا دەسووڕایەوە، لەو ماوەدا ئینگلیز جەورێکی زۆری دەنواند، بەڵام هاتوچۆی پیاوی شێخ بە دزییەوە هەر هەبوو[2]، ئەم جەورو ستەمەی ئینگلیز هۆشێکی نوێی هێنایەوە بەبەر خەڵکیدا، سەرۆك تیرەکان لە دەوری شێخ کۆبوونەوە، هاتنە سەر ئەوەی پەلاماردانێکی مردنو ژیان بەرنە سەر ئینگلیز[3] و سلێمانی بگرنەوە[4]، بۆیە خۆیان بۆ ئەم هێرشە ئامادەکردو بەرەو سلێمانی رۆشتن، توانرا لە (11/تەمموز/1923)دا شار بگرنەوە، ئینگلیزەکانیان دەرپەڕاند، شێخ مەحمود سەرلەنویٚ دەستیکرد بە قایمکردنەوەی سلێمانیو حکومدارێتییەکەی جارانی[5]. پاشان دانیشتووانەکەیان هەڵناو یارمەتی ئەوانەی دەدا کە رایان کردبوو لە ترسی ئینگلیز بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە ناو شار، بەڵام پاشماوەی ترسو دوودڵی هەر بە سیمای خەڵکی شارەوە مابوو[6].

پاش جێگیربوونی دەسەڵاتی شێخ بۆ جاری دووەم، هەوڵێکی زۆر درا بۆ نەهێشتنی ناکۆکی لە نێوان حکومەتی شێخو هەردوو دەوڵەتدا، بەڵام بێسوود بوو، چونکە دەیانویست شێخ بکەن بە داردەست، گوێی خۆیان لەو هەموو پەیمانانە کەڕکرد[7]، دەستیانکرد بە سنووردانانی دەستەڵاتەکەی شێخو ناوچەکەیان گەمارۆدا، رێگەیان بە شێخدا تەنها لە سنووری سلێمانیدا هاتوچۆ بکات[8]، پێیان راگەیان کە قەزاکانی رانیەو قەڵادزەو چەمچەماڵو هەڵەبجەو قەرەداغوسەنگاوو ناحیەی ماوەت، تەریکایەتی تەواو بووەو نابێت بە هیچ شێوەیەك دەستکاری بکرێت، ئەو گوندانەی کە پەیوەندییان بە ساداتی سەرگەڵووەوە هەیە، ئەوا نابێت شێخ بیانگاتیٚ، لەو راگەیانندەدا هاتبوو کە: "ئەگەر بە پێچەوانەوە بجوولێتەوە، یان هەوڵی زیادەڕۆیی کردن بدات، ئەوا بە بەهێزترین رەفتار لە بەرامبەری دەجوولێنەوە"[9]. شێخ ویسی سوود لە کات وەربگرێت، بۆیە دوبارە داوایکرد سلێمانی لەلایەن مەندوبی سامییەوە بەڕێوە ببریٚ، بەڵام ئەمجارەش رازی نەبوون[10]، شێخ کە زانی لە بەرژەوەندی نییە، هەوڵیدا بچێتە ئەو ناوچانەی کە دەسەڵاتدارێتییەکەی جیاکرابوونەوە، بەتایبەتی

---

[1] سجادی: شۆڕشەکانی کورد، ل100.

[2] یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 119.

[3] یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 119–120.

[4] سجادی: شۆڕشەکانی کورد، ل100.

[5] هەندێك سەرچاوە دەڵێن پێش ئەم ماوە لە مانگی ئازاردا کاتێك شێخ شاری چۆڵکرد، (ئۆزدەمیر) هەستا بە سەردانێك بۆ لای شێخ لە جاسەنە بۆ ئەوەی شێخ رازی بکات سلێمانی بگرێتەوە، هەرچەندە شێخ هەوڵیدا بەڵام سەرکەوتوو نەبوو. منتشا شغیلی: (هـ.س)، ص325–326.

[6] سجادی: شۆڕشەکانی کورد، ل100.

[7] منتشا شغيلي: (هـ.س)، ص328. سجادی: شۆڕشەکانی کورد، ل100.

[8] یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 127. عومەر عەبدولعەزیز هەورامانی: (هـ.س)، ص98.

[9] یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 128.

[10] ستیڤن سی بلیتر: (هـ.س)، ص68.

[11] یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 128–129.

[12] منتشا شغيلي: (هـ.س)، ص329.

ماوەت، ئەمەش وایکرد کە فڕۆکەکانی ئینگلیز هێرش بکەنە سەر بنکەی شێخ لە سلێمانی، بۆردومانی شار بکەن لەم هێرشانەدا دوو فڕۆکە کەوتنە خوارەوە [1]، بەردەوام دەستدرێژیو بۆردومانی دەورووبەریان کرد، زۆر ئافرەتو پیرو منداڵ بوون بە قوربانی ئەو هێرشانە [2]، بارودۆخەکە زیاتر بەرەو گرژبوون ڕۆیشت لە نێوان مەندوبی سامیو شێخ مەحموددا، بەتایبەتی بەهۆی ئەو کوشتارەی کە لە کەرکوك ڕوویدابوو لەلایەن فەلەکانەوە [3]. شێخ ویستی زیاتر لە سەری بڕوات، بەرامبەر مەندوبی سامی لەگەڵ وەزیری ناوخۆی عێراقو سەرۆك وەزیرا بڕیاری کۆتاییدا بۆ لەنابردنی دەسەلاتی شێخ.

پاش ئەم بڕیارە لە هاوینی ساڵی 1924. لەشکری سوپای عێراق لەگەڵ چەند بەشێکی هێزی ئاشووری، بە هاوکاری لەگەڵ هێزی ئاسمانی ئینگلیزی دەستیان بە پێشڕەوی کرد بەرەو سلێمانی، سەرەتا شەڕ لە چەمچەماڵو دەربەندی بازیان دەستی پێکرد، هێرشو پەلاماری داگیرکەران زۆر زیادبوو، بەشێوەیەك بەراورد نەدەکرا، لەگەڵ سوپای شێخ مەحموددا، لەلایەن ژمارەی سەربازانو چەكو تەقەمەنییەوە، جگە لەمەش تابوری پێنجەم [4]، لە ناوەوە دزەی دەکرد بۆ پشتگیریکردن لە هێزی داگیرکەرو ڕووخانی حکومەتو لەناوبردنی دەسەلاتی کوردی بە سەرۆکایەتی شێخ مەحمود [5]، بۆیە لایەنگرانی دابەشبوون، بەو هۆیەوە شێخ مەحمود لە (19/تەمموز/1924) سلێمانی بەجێهێشتو بەرەو سنوری ئێرانو شاخەکان کەوتەڕێ، پاش ئەوەی کە مەلیکایەتییەکەی نەما، سلێمانی لەلایەن ئەو هێزەوە داگیرکرایەوە [6].

بارەگای لەشکری کوردستان ڕۆیشتە شارباژێڕو بۆ پەلاماردانی لەشکری دوژمن، هێزی کوردستان بە ناوچەکانی کەرکوكو دوزخورماتوو چەمچەماڵدا بڵاوبوویەوە، شەڕو پێکدادان بەردەوام بوو لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستان، هەرچەندە ئینگلیز هەوڵیدا بەتوندی دەسەلاتی خۆی بچەسپێنێت لە ناوچەکە، بەڵام بارودۆخەکە هێمن نەبوو، [7] بە ڕادەیەك مەلیك فەیسەڵ لە (20/نیسان/1924) سەردانی کەرکوكو کفریی کرد، نەیتوانی بچێتە سلێمانییەوە، هەرچەندە شێخ لەو سنورە نەبوو [8]، ڕووبەڕووبوونەوە لە نێوان شێخو هەردوو حکومەتدا بەردەوام بوو تا ڕووخانی وەزارەتی یاسین هاشمی (1924/8/2) نەیتوانی بزووتنەوەی شێخ لەناوبەرێت، هەرچەندە شاریش گیرابوو، بۆیە بە دەستپێشخەری مەندوبی سامی، ئەنجومەنی وەزیرانی عێراقی لە دانیشتنی (3/حوزەیران/1925) بڕیاریدا شەست هەزار ڕوپیە تایبەت بکات بۆ ئەوەی شێخ بە دیل بگرێتو چارەکی ئەو بڕە بۆ ئەو کەسەی دەیکوژێت، بەڵام شێخ بەرامبەر بەم بڕیارە هیچ نەرمییەکی پیشان نەداوە، شۆڕشگێڕەکان لە پلەیەکی بەرزی دەروونیدا بوون، چونکە لە پێناو دۆزێکی پیرۆزدا فیداکارییان دەکرد. [9]

عەبدولموحسین حەمدون کاتێك لە (1925/6/26) وەزارەتی نوێی لە عێراق پێکەوەنا، پێی وابوو کە سیاسەتی توندوتیژی بەرهەمی باشی نابێت، بۆیە پەیوەندی بە شێخەوە کرد کە لەو کاتەدا پێنجوێن لەژێر دەستیدا بوو، بۆیە شەڕ

---

[1] حامد مەحمود عیسی علی: (هـ.س)، ص141–142.

[2] یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 129.

[3] ئەم ڕووداوە ئەوەبوو کە ژمارەیەك لە دانیشتوانی کورد لە کەرکوك بەدەستی فەلەکان کوژرابوون، شێخ دەیویست تۆڵەبکاتەوەو مەندوبی سامی دەیپۆشا. سجادی: شۆڕشەکانی کورد: ل101.

[4] ئەو کۆمەڵەیەبوون کە لە شاردابوونو لەلایەن ئینگلیزەوە بەکرێ گیرابوونو دژایەتی هێزی ڕزگاریخوازی کوردیان دەکرد، سجادی: شۆڕشەکانی کورد، ل101.

[5] سجادی: شۆڕشەکانی کورد، ل102.

[6] طالب عبدالجبار حیدر: (هـ.س)، ص122.

[7] یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید: ل 129.

[8] کریس کۆچێرا: (هـ.س)، ل340. طالب عبدالجبار حیدر: (هـ.س)، ص123.

[9] حامد مەحمود عیسی علي: (هـ.س)، ص142–143.

دەستپێکردەوەو حکومەتی ئینگلیزو عێراق توانیان پێنجوێن بگرن، شێخ بە ناچاری بە مەرجەکانی[1] هەردوو دەوڵەت رازی بوو بەپێی پەیمانی (2/نیسان/1923)[2].

بەمشێوەیە هەوڵەکانی شێخو بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردی کە بەهۆی خۆبەختکردنی چەندەها رۆڵەی کورد تا رادەیەك بە ئامانج گەیشت، بەهۆی بەرژەوەندی نێودەوڵەتی بەگشتیو دەوڵەتی بەرێوەبەر بەتایبەتی شکستیهێنا.

[1] دەربارەی ئەم مەرجانە بگەرێوە طالب عبدالجبار حيدر: (م.س)، ص123–124.
[2] حامد مەحمود عيسى على: (م.س)، ص143.

## هۆكاری شكست

بۆ هەموو دیاردەیەكی سیاسییو كۆمەلایەتی ژمارەیەك فاكتەر پێكەوە دەبێت بەهۆی سەرهەڵدانو لەناوچوونو نسكۆی ئەو دیاردە سیاسییو كۆمەلایەتییە.

بزووتنەوەی رزگاریخوازی كوردیش بە سەرۆكایەتی شێخ مەحمودی حەفید، وەك دیاردەیەكی سیاسیو كۆمەلایەتی، لە نێوان ساڵانی (1922–1925)، كە لە راستیدا هەڵدانەوەیەك بوو، بەسەر ئەو سروشتە سیاسیو كۆمەلایەتییەی كە كوردی تیادابوو، ژمارەیەك فاكتەر بوو بەهۆی سەرهەڵدانو گەشەكردنی بزووتنەوەكە لە هەر قۆناغێك لە قۆناغەكانی رێرەوی خەباتیدا.

ئەوەی ماوە باسی لێوە بكەین هۆكانی رووخانی ئەو بزووتنەوانەی شێخە، بەتایبەت رووخانی حكومەتو مەلیكایەتی، كە لەم ئاستەدا بزووتنەوەی رزگاریخوازی كوردی گەشتە لوتكە، دەربارەی مێژووی خەباتی شێخو ئەو قۆناغە سیاسیەی كە كوردی تیابوو، لێرەدا بە كورتی لەو هۆیانە دەدوێین، كە بوون بەهۆی شكستی ئەو ئەزموونە كەم وێنەیەی كورد.

### فاكتەرە دەرەكییەكان

1– بەرژەوەندی نێودەوڵەتی: زۆربەی ئەو بزووتنەوەو راپەرینانەی كورد كە لە سەدەی نۆزدەو بیستدا سەری هەڵدەدا، هەتا لەگەڵ سیاسەتو بەرژەوەندی دەوڵەتانی گۆرەپاندا دەگونجا، درێژەی دەكێشاو پشتگیرییان لێدەكرد، بەپێی بە ئەنجامگەیاندنی مەبەستەكەی خۆیان، بەڵام خێرا پاش ئەوە خۆیان لە ئاست بەڵێنو پەیمانەكاندا بێدەنگ دەكردو یەكلادەبوونەوە بۆ لەناوبردنی، شۆرشی شێخ مەحمود بەشێوەیەكی پێشكەوتوو لەوانە، كە لە دروستكردنی حكومەتو راگەیاندنی مەلیكایەتی خۆی بینییەوە، ئەم فاكتەرە بە روونی لە نسكۆی شۆرشەكەیدا دەبینرا ئەوەبوو پاش پێكهێنانی حكومەت لە ساڵی 1922 زۆری نەبرد پەیوەندی لەگەڵ ئینگلیزو عێراقدا تێكچوو، ئەوەبوو لە ساڵی 1923 چەند بروسكەیەكی نارەزایی بەرامبەر بە سیاسەتی ئینگلیز بۆ هەموو باڵیۆزخانە نێودەوڵەتییەكان لە تاران نارد، بە هیوای ئەوەی چارەیەك بۆ دۆزی كورد بدۆزنەوە وەك هەموو گەلانی دنیا، بەڵام هەموو هەوڵەكانی شێخ لەم پێناوەدا بەبێ ئەنجام مایەوە.

2– سروشتی شۆرشەكەی شێخو شوێنە جوگرافییەكەی، بەتایبەت سلێمانی كە كرببووی بە پایتەخت، ناوچەیەكی ستراتیژی گرنگ بوو بە لای هەردوو دەوڵەتی نەیار (ئینگلیزو تورك)، ئەوەبوو پاش جەنگی یەكەمی جیهانی لە گرنگترین فاكتەری ئاڵۆزی پێوەندیان بوو، ئەمە وایكردبوو كە هەر دەوڵەتێك بۆ بەهێزكردنی دەسەلاتی خۆی لە ناوچەكە، بەپێی كات یارمەتی شێخ بدات، بە پلەو نازناوی بریقەدار تەفرەی بدەن، بەڵام وەك باسكراوە، پاش گۆرانی هەڵوێستی شێخ بەرامبەر دەوڵەتێكیان، خێرا دژی وەستاوەو بە خراپترین شێوە دادگای كردووە.

3– پەیوەندی شێخ بە هەردوو دەوڵەت، زیاتر لە پەیوەندی كەسایەتی خۆی دەبینییەوە، نەك سیاسەتی دەوڵەتەكان، وەك ئۆزدەمیر لە دەوڵەتی توركو میجەر نۆئێل لە لای ئینگلیز، هەریەكەیان لە پێناو خۆنزیككردنەوە لە دەوڵەتەكەیو سەركەوتنی سیاسەتی لە ناوچەكە، بەڵێنی سەربەخۆیان دەدا بە شێخ، بۆیە بەم بەڵێنانە شێخ تەفرەی خواردو لە كاتی پێویستدا خۆیان لێ نزیك نەدەكردەوە، وەك (قاسم خلق الجمیلي) لە نامەكەی خۆیدا دەڵێت: "كاتێك سلێمانی لە لایەن ئینگلیزو عێراقەوە گیرایەوەو حكومەتەكەیان رووخاند، ئۆزدەمیر هیچ هەڵوێستێكی نەبو،و ئەوە نەبێت بڵێت بەدلخەوەم كە ناتوانم یارمەتی شێخ بدەم".

4– دامەزراندنی حكومەتی شێخو بەپێشەوە چوونی باری سیاسی لە كوردستاندا لە نێوان ساڵانی (1922–1925)، لە كاتێكدابوو كە جەنگی یەكەمی جیهانی تەواو بووبوو، روسیا لە دەركەوتندا بوو بەهۆی شۆرشەكەیەوە، جیهان بەرەو دابەشبوون بە دوو جەمسەر دەرۆیشت، باری سیاسی نێودەوڵەتی زۆر ئاڵۆز بوو، بۆیە كاتێك شێخ پەیوەندی بە رووسیاوە

کرد، بارە سیاسییەکەی زیاتر گرژکردو لەو سەردەمانەدا پەیمانی لۆزانی ساڵی 1923 بەسترا لە نێوان هاوپەیمانەکانو حکومەتی تورکیادا، مافی کورد تەواو پێشێلکراو دەوڵەتانی رۆژئاوا بەگشتیو ئینگلیز بەتایبەتی هاتنە سەر ئەوەی هەرسێ دەوڵەتی تورکیاو ئێرانو عێراق دروستبکەنو یارمەتییان بدەن لەپێناو بەربەستکردنی هاتنەخوارەوەی دەسەڵاتی رووسی بۆ رۆژهەڵاتو ئاوەگەرمەکان، ئەمەش لەسەر حسابی گەلانی ناوچەکە دەبێت بەتایبەتی کورد.

### فاکتەرە ناوخۆییەکان

1- زۆربەی سەرچاوەکان دەڵێن، ئەو حکومەتو بەڕێوەبردنەی کە شێخ پێکەوەی نابوو، زیاتر شێوازی سادەو ساکاری بەخۆوە گرتبوو، دووربوو لە جێبەجێکردن بەپێی بنچینەی بۆ دانراو نەدەڕۆیشت بەڕێوە، وەك عەبدوڕڕەزاق حەسەنی لە کتێبەکەی خۆیدا (تأريخ العراق السياسي)دا کە لە راپۆرتی ئینگلیزی وەریگرتووە دەڵێت: "لەگەڵ بوونی ئەنجومەنی وەزیرانو وێنە ئەنجومەنی پرسو رادا، کە پێکهاتبوو لە سەرۆك هۆزەکانی سنووری ناوچەکە کارویار بە چاکی بەڕێوە نەدەچوو، نە گومرگو رسوم کۆدەکرایەوەو نە بڕیاری کۆکردنەوەو چەند تێبنیەکەی دەردەچوو، بەمەش لایەنی ئابووری حکومەتەکەی لاوازدەکرد".

2- شێخ مەحمود زیاتر پشتی بە پیاوانی خێڵەکیو سەرۆك تیرەکان دەبەست، ئەوانەی شارەزایی بەڕێوەبردنیان کەمبوو، بەپێچەوانەوە خۆی لە رۆشنبیرەکان بەدوور دەخست، کاتێك ئەفسەرانی کورد کە لە دەوڵەتی عوسمانی کۆن خزمەتیان دەکرد، گەڕانەوە بۆ سلێمانی بە مەبەستی خزمەتکردنی حکومەتە کوردییەکە، شێخ لە جیاتی ئەوەی لە بارتەی بەڕێوەبردنی خۆی سوودیان لێببینێت، بەپێچەوانەوە زۆر گرنگی پێنەدان، بۆیە شۆڕشەکە زۆرجار بێ رێکخستن بوو.

3- دواکەوتوویی بارودۆخی ئابووریو کۆمەڵایەتی ئەوکاتەی کۆمەڵگای کوردی، کە زیاتر دەرەبەگایەتی بوو، سروشتی ئەم رژێمە لەگەڵ شۆڕشو بزووتنەوەیەکی پێشکەوتووخوازدا نین بە درێژایی شۆڕشەکانی شێخ هەمیشە هەندێك هۆز نەیاری بوونو لەگەڵیدا نەبوون، چونکە بەرژەوەندی ئابووریو پلەی کۆمەڵایەتییان لەگەڵ شێخدا نەدەگونجا. هەر بۆیە هەمیشە پاڵپشتی ئینگلیز بوون.

4- بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردی بەسەرکردایەتی شێخ نەیتوانی رووبەڕووی ئەو تەحەدیو مەترسییانە بێتەوە، کە لە ژێرەوە بۆ رووخانی بەڕێوەبردنەکەی دزەی دەکرد، پێویست بوو لەسەری کوردەکان بە رێگایەکی نوێتر ئامادەبکات کە جیاوازبێت لە دابو نەریتی کۆن، بە شێوەیەك کە پەیوەندی خێڵەکی بگۆڕێت بە پەیوەندی ئایدۆلۆژیاو بتوانێت ئەو ئایدۆلۆژیایە بگۆڕێت بە واقیعو سروشتێکی کرداری دیار، کە لە یەکێتی چەکداریو سیاسی خۆی دەبینێتەوە.

5- سوود لە مێژوو نەبینینو دووبارەبوونەوەی وەك خۆی، وەك چارەسەرنەکردنی ئەو دەردو نەخۆشییانەی کە لەناو بزووتنەوەو شۆڕشە کوردییەکاندا روودەدات، شێخ هەڵنەستا بە لەناوبردنی ململانێی دەرەبەگەکان، بە شێوەیەك ئەو هێزو توانایەی کە لە نێوان یەکتریدا سەرفی دەکەن، ئاڕاستەی بکات بۆ بەرژەوەندی شۆڕشەکەی.

جگە لەوە رێکخستنیش لە ناو ئەندامانی خێزانەکەیدا نەبوو، هەر یەکێك بەپێی نزیکی لە شێخەوە هەڵسوکەوتی دەکرد، وەك شێخ لەتیف لە یاداشتەکانی خۆیدا ئاماژەی بۆ دەکات، ئەمەش بوو بەهۆی ئەوەی کە لە کاتە پێویستو نارەحەتەکاندا شێخ بەجێبهێڵن.

6- شێخ بەپێی ئەو سروشتو پێکهاتە بنەماڵەییەی کە تیایدا بوو، لە زۆر بواردا دکتاتۆرییەتی بەکاردەهێناو دووربوو لە راوێژکاری، بۆچوونی خۆی دەسەپاند لە دیاریکردنی رێڕەوی سیستەمی بزووتنەوەکەیدا. بۆیە لە زۆر بواردا راست بۆ رووداوەکان نەدەڕۆیشت. وەك ئەحمەد تەقی دەڵێت: "شێخو دەوروپشتەکەی لە سیستەمدا کۆڵ بوونو لەبەر ئەوەی لە ئینگلیز زویربوون خێرا روویان بەلای تورکدا وەرگێڕا، ئەمەش بە خراپ بەسەریدا شکایەوە".

7– فاكتەری بنچینەیی بۆ نسكۆی ئەوئەزموونە كەم وێنەیەی كورد نەبوونی یەكسانی بوو لە نێوان هێزی شێخو لایەنی بەرامبەردا لە رووی چۆنێتیو چەندایەتی هێزەوە، ئەمەش وایكرد رووداوەكان بەپێی ستراتیژیو سیاسەتی داگیركەر بڕوات بەڕێوە، ئەویش رووخانی بەڕێوەبردنەكەی شێخ بوو.

8– شێخ مەحمود مامەڵەی نەرمو سیاسییانە نەبوو لەگەڵ ئینگلیزو حكومەتی عێراقدا، ستراتیژییەتێكی گەورەی داڕێژراوی لەبەردەمدا نەبوو كاری لەسەر بكات، هەر دەیویست بە هێزو خوڕینو بە پەلە كارەكان بكاتو كورسی بۆ خۆی دەستبخات، سووربوو لەسەر ئەوەی كە لە زەینی خۆیدا هەبوو دەخولایەوە.

9– راڕایی شێخ، دەمێك دەیدایە پاڵ عوسمانیو دەمێك دەهاتەوە بۆ لای ئینگلیزو ئەم سەنگەر گۆڕینەوانە وایكرد كە ئینگلیز بڕوایان بە شێخ نەمێنیٚو كاری جدی لسەر نەكەن، بەتایبەت كە لەم دواییەدا خۆی گلاند بە لاكردن بەلای رووسیاو شیوعییەكانەوە كە هەرە دوژمنی سەرسەختی ئینگلیز بوون.

10– پوازێتی كوردو خۆخۆریو كلكایەتی كوردی بۆ دوژمن، كە هەمیشە هۆیەكی سەرەكی بووە بۆ لەناوبردنی میرنشینە كوردییەكان، لەسەردەمی شێخ مەحمووددا توركو ئینگلیز زۆر ئاسان دەیانتوانی یاری بە سەرەك خێڵو شێخە كوردەكانەوە بكەنو دژی شێخ مەحمود بیانجولێننو بەربەستبن لەبەردەم هەوڵە كوردییەكاندا.

## دەرئە نجام

1– لە گرنگترین ئەنجامی ئەو ئەزموونە پڕپایەخە لە مێژووی سیاسی گەلەکەمان و نسکۆی، ئەوەبوو هێزی داگیرکەر بە شێوەیەکی دڕندانە هاتنەوە کوردستان و حکومەت و مەلیکایەتییەکەی شێخیان لەناوبرد، کە بە خوێنی چەندەها رۆڵەی بە ئەمەکی گەلەکەمان پێکهاتبوو. دەستیان بە سەرکوتکردنەوەی شۆڕشەکەی شێخ کرد بە توندترین شێوە، زیاتر لەوەش ناوچەی کوردستانی عێراقیان بەستەوە بە حکومەتی عێراقی تازە دامەزراو، بەمەش ئاوات و ئامانجی گەلی کورد رۆشتە ژێر گڵەوە و بوو بە قوربانی سیاسەت و بەرژەوەندی بەریتانیا.

2– هەوڵ و تێکۆشانی شێخ و داکۆکیکردن لەسەر بەئەنجامگەیاندنی دۆزی میللەتەکەی، بە چاوپۆشین لە هەورازو نشێوو مەترسی ژیانی خۆی کە هەموو تەمەنی گرتبوویەوە، سروشتێکی سەرکردەیی و پابەندبوونی شێخ دەردەخات بەرامبەر بە واقیع و تراژیدیای گەلی کورد، بۆیە عەبدوڕڕەزاق حەسەنی لە (تأريخ الوزارات العراقية)د1 لە وەسفی شێخدا دەڵێت: "شيخ محمود الحفيد هو القضية الكردية، والقضية الكردية هي شيخ محمود الحفيد".

3– ئەو ئەزموون و قۆناغە سیاسییەی شێخ، ئەوەمان بۆ رووندەکاتەوە هەرکاتێك گەل لە نێو خۆیاندا رێکبن و یەکگرتووبن بە هەموو چین و توێژو رۆشنبیرو جەماوەرەوە و بەتەنگ دۆزەکەیانەوەبن، ئەوا هەڵوێستی ساسییان لە دەرەوە بەهێز دەبێت و دوژمن ناچار دەبێت گوێ بۆ داواکارییەکانیان بگرێت، ئەم هۆیە دەوری گرنگی بینی لە گەڕانەوەی شێخ و دامەزراندنی حکومەتی کوردستانی خواروو لە ساڵی 1922.

بۆیە دەبێت بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردی لە مرۆڤا بە گرنگییەوە تێبینی ئەم فاکتەرە بکەن، ئەگەر نا مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوە.

4– بە تێڕوانین لە شۆڕشەکانی شێخ و ئەو ناخۆشی و ئەزموونە تاڵانەی کە تیایدا روویدا، بەهۆی سیاسەتی رەگەزپەرستی و توندوتیژی هێزی داگیرکەرەوە، ئەمانگەیەنێتە ئەو ئەنجامەی کە ئەگەر بە شێوەیەکی وردبینانە و راست سەیری پێش هاتن و پاش هاتنی ئینگلیز بکەین بۆ عێراق و کوردستان، راستیەك دەردەکەوێت ئەویش ئەوەیە کە هیچ جۆرە کێشەیەکی ئەوتۆ لە نێوان عەرەب وکورددا نەبووە پێش ئینگلیز، گیانێکی برایی بەهۆی دین و هاوخەباتییان لە پێناو دروستکردنی شارستانییەتی ئیسلامیدا هەبووە، بەشداریکردنی شێخ لە جەنگی دژی ئینگلیز لە شوعەیبە بە هاوشانی برا عەرەبەکانی، ئەو راستییەمان بۆ دەردەخات، بەڵام پاش هاتنی ئینگلیز و پیلانە گڵاوەکانی بۆ ناوچەکە، سروشتی پەیوەندییەکان گۆڕان، رەگەزپەرستی نەتەوەیی بە جۆرێك هاتە کایەوە، ئەزموون و رووداوە تراژیدیاکانی ئەوکاتە و ئێستای عەرەب و کورد دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بنچینەیە.

5– دروستکردنی حکومەت و ئەنجومەنی وەزیران، دادەنرێت بە قۆناغێك لە قۆناغە گرنگەکانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردی، لە مێژووی سیاسی و سەربازی گەلەکەمان، کە تیایدا گەلی کورد هەستیکرد نەتەوەیەکی سەربەخۆیە و خاك و مافی خۆی هەیە و شارستانیەتی تایبەتی هەیە و پێویستە مافی وەك گەلانی جیهان بپارێزرێت، ئەمەش لە قۆناغی ئێستای گەلەکەماندا تا رادەیەك هەستی پێدەکرێت.

ئەو ئەزموونە بە گەورەترین چالاکی شارستانی و رۆشنبیریش دادەنرێت کە پێشکەش بە گەل و رۆڵەی داهاتووی ئەو گەلە کرا، ئەو چالاکییە زیادی کرد کاتێك شێخ گرنگی بە لایەنی رۆشنبیری داو رۆژنامەی دەرکردو هەوڵی خوێندنی دەداو سوپای یاسایی کوردی بە رادەیەك بەهێزکرد.

کاریگەری ئەم دەسکەوتە پڕبایەخە لە هەموو شۆڕش‌و بزووتنەوە کوردییەکان تا ئێستا درێژ دەبێتەوە، مەبەستی شێخ‌و ئەو حکومەتەی کە ئەیویست دروستی بکات، کە زۆربەی ناوچە کوردییەکانی عێراق بگرێتەوە تا ئێستا لە ستراتیژی بزووتنەوەی کوردیدا نەڕۆشتۆتە باری کردارییەوە.

# ليستى سەرچاوەكان


## سەرچاوە كوردیو بەكوردی كراوەكان

ئەحمەد خواجە

1- چیم دی، ب3، چاپخانەی (شەفیق)، بەغداد، 1968.

ئەحمەد تەقی

2- خەباتی گەلی كورد لە یاداشتەكانی ئەحمەد تەقیدا: لاپەڕەیەك لە شۆڕشەكانی كوردو شێخ مەحمودو سمكۆو هەستانەكەی ڕەواندز، ڕێكخستنو ئامادەكردنی بۆ چاپ: جەلال تەقی، بەغداد، 1970.

ڕەفیق حیلمی

3- یادداشت، بەرگی 1-2-3، چاپخانەی ڕۆشنبیریو لاوان، بەغداد، 1988.

عەلادین سوجادی

4- شۆڕشی كوردو وەكوردو كۆماری عێراق، چاپخانەی مەعاریف، بەغداد، 1959.

عەزیز شەمزینی

5- جولانەوەی ڕزگاری نیشتمانی، (و: ئەسەسەد) ژمارەی چاپ2، (ب.ش) 1985.

د. عبدالرحمن قاسملو

6- كوردستانو كورد، (و. عەبدوللا حەسەن زادە)، لە بلاوكراوەكانی بنكەی پێشەوا، (ب.ش) 1973.

كریس كۆچیرا

7- مێژووی كورد لە سەدەی 19-20دا، (و: موحەممەد دیانی)، چ2، چاپخانەی (صدف)، تهران، 1369.

كەمال مەزهەر

8- چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی كورد، ب1، چاپخانەی الأدیب البغدادیة، 1985.

شێخ لەتیفی حەفید

9- یاداشتەكانی شێخ لەتیفی حەفید، شۆڕشەكانی شێخ مەحمودی حەفید، كەمال نوری مەعروف ساغیكردووەتەوە، چ1، (ب.ش)، 1995.

## سەرچاوە عەرەبیو بە عەرەبی كراوەكان

أ.م. منتشا شغیلي

10- العراق في السنوات الانتداب البریطاني: (ت: هاشم صالح التكریتي) مطبعة جامعة بغداد، 1978.

مس بیل

11- فصول من التأریخ العراق القریب، (ت: جعفر الخیاط، ط2، (ب.م)، 1971.

د. جورج حجّار

12- المسألة الكردیة، مطبعة دار القدس، (ب.م)، ابربیل، 1975.

حامد محمود عیسى علي

13- المسألة الكردیة في الشرق الأوسط منذ بدایتها حتى سنة 1991، مطعبة (مدبولي)، (ب.م)، 1992.

حسین جمیل

14- العراق شهادة سیاسیة 1908-1930، مطبعة دار السلام، لندن 1987.

ستیظن سي بلیتر

15– الأكراد عنصر الأضطراب، (ت: سةعدون موحةممةد)، (ب.م)، (ب.س).
شوكري محمود نديم
16– احوال العراق في المرحلة الشروطية الثانية 1908–1918، رسالة ماجستير، 1985.
عبدالرزاق الحسني
17– تأريخ الوزارات العراقية، ج1–2، طبعة الرابعة للموسوعة، بيروت، 1974.
18– تأريخ العراق السياسي الحديث، ج3، (ب.م)، 1948.
عزيز الحاج
19– القضية الكردية في العشرينات، ط2، مطبعة الأنتصار، بغداد، 1985.
عبدالوهاب القيسي
20– تأريخ العالم الحديث، 1914–1945، ط1، جامعة البغداد، كلية التربية 1983.
عمر عبدالعزيز هوراماني
21– القضية الكردية في المؤمرات لدولية، من منشورات جمعية علماء كردستان، ج2، 1993.
قاسم خلف عاصي الجيلي
22– العراق والحركة الكمالية 1919–1923، رسالة دكتوراه، تقدم بها الى كلية الأداب، جامعة بغداد، أيلول 1990.
د. كونتر دشنر
23– احفاد صلاح الدين الأيوبي، (ت: عەبدوسەلام مستەفا سديق)، دهۆك، 1992.

**سەرچاوە فارسييەكان**

حسين مدنى
24– كردستان، بدرسي وتحليل نهضتهاى آزاد بخش نيللي در كردستان، اسفند ماه –1372.
درك كينان
25– كردها وكردستان، ترجمه أز فارسى (ئيبراهيم يونسى)، چاپ أول 1372.
گۆڤارو رۆژنامەكان
26– احمد عثمان ابوبكر: (بيانات وتصريحات كولونيل ميراللآى اوزدمير باشا الى القبائل الكردية) صحيفة (خبات)، ع (834)، 1997/7/25.
27– عومەر مارف بەرزنجى: (مەحمودخانى دزلّى و چەند لاپەڕەيەك لە مێژووى گەلى كورد) رۆژنامەى (رۆژى كوردستان)، ژ (4)، حوزەيران 1973.
28– فؤاد حمه خورشيد: (حلبجة في عام 1919)، صحيفة (عراق)، ع (1017)، 1979/7/2.
29– فەيسەڵ دەباغ: (نامەيەكى بڵاونەكراوەى شێخ مەحمود)، رۆژنامەى (برايەتى)، ژ (1814)، 2شەممە 1993/12/6.
30– كەمال مەزهەر: (نامەيەكى ونى شێخ مەحمود بۆ كەمالييەكان)، گۆڤارى (رەنگين)، ژ (107)، 14/كانونى يەكەم/1997.
31– د.عثمان على: (اسماعيل آغا سمكو ثعلب السياسة الكردية ورائديها في البرغماتيكية) مجلة (ئاڵاى ئيسلام)، ع (1)، كانوني الثاني و شباط 1993.

32- ڕەنجیار: (ئیسماعیل خانی شکاك)، گۆڤاری (ڕابەر)، ژ (31-32)، ساڵی چوارەم 1995.

33- مەحمود موحەممەد بیرپیژی: (ئاکامەکانی جەنگی جیهانی یەکەم لەسەر کوردستان)، گۆڤاری (ڕامان)، ژ (20)، 1998.34/2/5.

## نووسەر لە چەند دێڕێکدا



– ئومێد حەمەئەمین حەمەسالح، لە 1971/5/21 لە گوندی هانەژاڵەی سەر بە قەزای هەڵەبجە لەدایک بووە.

– خوێندنی سەرەتای لە گوندی هانەژاڵەو چەند گوندێکی دیکە تەواو کردووە.

– خوێندنی ئامادەیی لە هەڵەبجەی تازە تەواو کردووە.

– ساڵی 1992 لە بەشی مێژووی کۆلێجی ئەدەبیاتی زانکۆی سەلاحەددین وەرگیراوە.

– ساڵی 1997 – 1998 بەکالۆریۆسی لە مێژوودا بەدەستهێناوە.

– ساڵی 1998 دەبێتە مامۆستا لە دواناوەندی سورێن لە شارۆچکەی سیروان.

– شەوی 2003/3/21 شەهید بووە.

## بلاوكراوەكانی پرۆژەی (تیشك)

| زنجیره | ناوی كتێب | نووسەر |
| --- | --- | --- |
| 1 | بەئیسلامكردنی كورد، ماستەرنامە یان هەڵەنامە ؟ | ن: فازل قەرەداغی |
| 2 | نەزانیی و بێشەرمیی، بەشێك لە چەواشەكارییەكانی مەریوان هەڵە بجەیی لە كتێبی (سێكس و شەرع و ژن)دا | ن: عومەر كەمال دەروێش |
| 3 | ئاشتینامە، وەڵامێك بۆ (خوێننامە)ی زەردەشتی | ن: ئامینە صدیق |
| 4 | فەتواكەی مەلای خەتێ، ئەفسانەی مێژوونووسێك | ن: حەسەن مەحمود حەمەكەریم |
| 5 | صەلاحەددینی ئەییوبی، گەورەتر لە رەخنەگرانی، گفتوگۆ لەگەڵ پرۆفیسۆر دكتۆر موحسین موحەممەد حسێن | ئا: ئارام عەلی سەعید |
| 6 | بەرەو بەختیاری ئافرەت "بەرگی یەكەم" | جەمال حەبیبوڵڵا "بێدار" |
| 7 | ئازادیی رادەربڕین لە رۆژئاوا، لە سەلمان روشدییەوە بۆ رۆجیە گارودی | ن: د. شەریف عەبدولعەزیم<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| 8 | بەجیهانیكردن، دیدێكی ئیسلامیی | ن: د. موحسین عەبدولحەمید<br>و: حەمەكەریم عەبدوڵڵا |
| 9 | كوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا | ن: حەسەن مەحمود حەمەكەریم |
| 10 | بەرەو بەختیاریی ئافرەت "بەرگی دووەم" | ن: جەمال حەبیبوڵڵا "بێدار" |
| 11 | مێژووی دێرینی كوردستان "بەرگی دووەم" | ن: فازل قەرەداغی |
| 12 | سەدەیەك تەمەنی نوورین، مامۆستا عەبدولكەریمی مودەرڕیس بە پێنووسی خۆی بناسە | ئا: عەبدولدائیم مەعروف هەورامانی |
| 13 | دەوڵەتی خیلافەت، بوژاندنەوەی كۆمەڵگەو گەشەسەندنی شارستانییەت | ن: ئیكرام كەریم |

| | | |
|---|---|---|
| 14 | لە سەرگوزشتەکانی ژیان، ئەدەبی گاڵتەوگەپ، رووداوی مێژوویی، بیرەوەریی | ن: شێخ موحەممەد خاڵ |
| 15 | پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان رامان و سەرنج و پێشنیار | ئا: پرۆژەی تیشك |
| 16 | بیست و سێ ساڵ سەروەریی | ن: ئەحمەد حاجی رەشید<br>دکتۆر صەباح بەرزنجی<br>پێشەکی بۆ نووسیوە |
| 17 | قورئان وەحی ئاسمانە، نەك رەنگدانەوەی سەردەمی خۆی | ن: بەکر حەمەصدیق |
| 18 | ئیسلام و سیاسەت، لێکۆڵینەوەیەك لەمەڕ پەیوەندی نێوان ئیسلام و سیاسەت | ن: ئارام قادر |
| 19 | سوپای ئەیوبیان لە سەردەمی سەلاحەددیندا<br>پێکهاتنی، رێکخستنی، چەکەکانی، هێزی دەریایی و شەڕو جەنگە گرنگەکانی | ن: پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن<br>و: عوسمان عەلی قادر |
| 20 | پوختەیەك دەربارەی رۆژوو | ن: عەبدوڕڕەحمان نەجمەدین |
| 21 | رۆڵی پرشنگداری زانا موسوڵمانەکان لە پێشکەوتنە زانستییەکاندا | ن: د. کاوە فەرەج سەعدون |
| 22 | یەکەمین دەستووری نووسراو لە جیهاندا، بەڵگەنامەیەکی گرنگی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ | ن: موحەممەد حەمیدوڵڵا<br>و: شوان هەورامی |
| 23 | ئیسلامناسیی یان ئیسلامنەناسیی، وەڵامێك بۆ کتێبی (ئیسلامناسی) عەلی میرفطروس | ن: ئیکرام کەریم |
| 24 | بەرەو بەختیاریی ئافرەت "بەرگی سێیەم" | ن: جەمال حەبیبوڵڵا "بێدار" |
| 25 | ئیشکردن نەك تەمەڵی | عەبدولعەزیز پارەزانی |

| | | |
|---|---|---|
| 26 | دوورگەی بیناسازان، چیرۆکێکی پەروەردەییە بۆ گەورەو بچووکی ئەم نەوە نوێیە | نووسینی: د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبو سلێمان<br>وەرگێڕانی: ئامینە صدیق عەبدولعەزیز |
| 27 | زمانی گەردەلوول، خەونی شنە با<br>کۆمەڵە دیدارێکە لەسەر شیعر، فەرهەنگ، زمان، تەسەووف، ڕۆژهەڵاتناسی، ژن، ڕەخنەی ئەدەبی، رووناکبیر و دەسەڵات | فەرهاد شاکەلی |
| 28 | هەڵەبجە 1889 ـ 1930، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە | ن: عادل صدیق |
| 29 | بەرگری لە قورئان دژی ڕەخنەگرانی | ن: عەبدوڕڕەحمان بەدەوی<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| 30 | فەرموودە هاوبەشەکانی بوخاری و موسلیم | ئامادەکردن و وەرگێڕانی: حەمەکەریم عەبدوڵلا |
| 31 | مەلا ئیدریسی بەدلیسی، ڕۆڵی لە یەکخستنی میرنشینە کوردییەکاندا | ن: حەسەن مەحمود حەمەکەریم |